# ئیڤۆ ئاندریچ

# گۆڕەبانی نەفرەتی



و: موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی











وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بلاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بلاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی

**• گۆڕەپانی نەفرەتی (رۆمان)**

---

**• نووسینی: ئیڤۆ ئاندریچ**

---

**• وەرگێڕانی: موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی**

---

**• نەخشەسازی ناوەوە: هاوڕێ**

---

**• بەرگ: جێگر عەبدولجەبار**

---

**• نرخ: ٢٥٠٠دینار**

---

**• چاپ: یەکەم ٢٠١١**

---

**• تیراژ: ١٠٠٠**

---

**• چاپخانە: وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان**

---

• لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٦١)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٥٠٧)**

ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز ئەم ڕۆمانەی لەبەردەستدایە یەکێکە لە ڕۆمانەکانی ڕۆماننووسی بۆسنیا (ئیڤۆ ئاندریچ ١٨٩٢ ـ ١٩٧٥) کە دووەمین ڕۆمانی هەمان نووسەرە لەم ماوەیەدا وەریدەگێڕین، بە هیوای ئەوەی توانیبێتمان هەقی خۆیمان پێ دابێت و بە کوردییەکی پوخت و ڕەوان خستبێتمانە بەر دیدی ئێوەی خۆشەویست.

هەڵبەت لە هەڵبژاردنی ئەم ڕۆمانەو ئەم نووسەرەو وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بۆ سەر زمانی کوردی دوو مەبەستمان هەیە، یەکێکیان ناسینی نووسەرو بەرهەمەکانی بە خوێنەری کورد، دووەمیان دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی بە ڕۆمان و کتێبی نەتەوەو زمانەکانی دیکەی جیهان، چونکە کتێبخانەی کوردی پێویستی بە هەموو نووسین و بەرهەمی وێژەیی و زانستی هەموو نەتەوەو زمانانی دیکەی جیهان هەیە، چ لە بواری وێژە یان زانست یان مێژوو یان کۆمەڵایەتی و بوارەکانی دیکەی ژیان، تا کوردیش لە ڕەوت و کاروانی بەرەو پێشەوەچووی شارستانیەت لە جیهاندا دوانەکەوێت.

هەروەها مەبەستێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە کە پێویستە وەرگێڕی کورد ئەوەی هەر زمانێك بزانێت و بتوانێت بەرهەمی پێ وەربگێڕێت لەو بوارەدا درێغی نەکات و تا بۆی دەکرێت نووسین و دانراوی وێژەیی و زانستی و بوارە بە سوودەکانی دیکە بۆ سەر زمانەکەی خۆی وەربگێڕیت، تەنانەت ئەگەر لە سێیەمین زمانیشەوە بێت، ئێمەیش بۆیە ئەم کارە دەکەین بۆ ئەوەی هەندێك لەو بەرپرسیاریەتە نەتەوەییەی لەسەر شانمانە بۆ خوێنەرو نەوەکانی ئێستەو داهاتوو سووك بکەین و هیواداریین لەم کارەماندا چەردەیەکمان خستبێتە سەر ئەو خەرمانە پڕ بەرەکەتەی کتێبخانەی کوردی کە لەم ساڵانەی دواییەدا لەڕووی چاپ و وەرگێڕانەوە تەکانێکی باشی بەرەو پێشەوە بەخۆوە بینیوەو هیواداریین سەرکەوتوو بین.

**موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی**

**٢٠٠٩/٢/١**

# ڕۆماننووس ئیڤۆ ئاندریچ..

## نووسەری پردەکەی سەر ڕووباری درینا و گۆڕەپانی نەفرەتی

لە هەشتاکاندا کاتێك دەستم بە خوێندنەوەی ڕۆمانی (پردەکەی سەر ڕووباری درینا)ی ڕۆماننووس (ئیڤۆ ئاندریچ) کرد، هەستم کرد کە نووسەرەکەی چووەتە ناخی کەسایەتی و ڕووداوەکانەوە، باسی وڵات و گەل و خاکێك دەکات، زۆر لە بارودۆخ و شێوەی وڵات و خاك و گەلەکەی منەوە نزیکە، ئەگەر هەر تەواو لەیەك نەچن. نووسەر ڕووداوو بەسەرهاتەکانی ئەو گەلانەی لە وڵاتی بۆسنیاو هەرزە گۆڤینا دەژین وێنە دەکێشێت، کە بە دەستی داگیرکاری جارێك تورکان و جارێك نەمساو مەجەرو جارێك سیربەکانەوە تاڵترین ژیان دەگوزەرێنن و خەم و خەفەت و پەژارە دەیانپووکێنێتەوە، ئەو داگیرکاری و زوڵم و زۆرەی دەستەڵاتدارانی عوسمانلی لەو گەلانەیان دەکرد لەو کارە نامرۆڤانەدا ڕەنگی دەدایەوە کە کۆرپەی بەر مەمکان و منداڵانی ساوایان لە دایك و باوکان دەکردەوەو بەرەو شوێنێکی دوور لەوڵاتی خۆیان، بۆ ئەستەنبووڵیان دەبردو لەوێ دەیانهێنانە ژێر ئایینی خۆیانەوەو ناویان دەگۆڕین و دەیانکردنە ئەندامانی سوپای ئەنکشارییەو شەڕی وڵاتانیان پێ دەکردن، ئەم کارە لەگەڵ کاری سەفەربەرلکی سەردەمی یەکەمین جەنگی جیهانیدا لە وڵاتی خۆمان یەك دەگرنەوە، کاتێك باوك و براو مێردو مام و خاڵ و کوڕیان لە کەس و کاریان دەکردنەوە بەرەو بەرەکانی جەنگیان ڕادەپێچان و دواتر بێ سەرو شوێن دەبوون و دەکوژران و نەدەگەڕانەوە.

ئەو ئازارو ژان و ئەشکەنجەو غەم و پەژارانەی لە ڕووداوو بەسەرهاتەکانی ئەم ڕۆمانەدا بەرچاومان دەکەوێت، کە هەر هەموویان پردەکەی درینا پێکەوەی بەستوون،

هەست بە هەمان ئەو ئازارو زوڵـم و زۆرەی عوسمانلییـەکان دەکرا کاتێـك تـا سـاڵەکانی بیستی سەدەی ڕابوردوو خاکی کوردسـتانیان داگیرکردبـوو، جۆرەهـا زوڵـم و زۆریـان لـەم گەلە ستەمدیدەو لەم خاکە بەپیت و فەڕە دەکردو، خەڵکیان بە باج و بە ناردنە بەرەکانی شـەڕی پیـاوە نەخۆشـەکە دەچەوسـاندەوەو برسـیەتی و بێکـاری و نـەداری و نـەزانین و نەخۆشییان پتر بڵاو دەکردەوە.

هەرکە ئەو بەسەرهات و چیرۆکە یەك لە دوای یەکانەی ئـەم ڕۆمانـەم دەخوێندنـەوەو تا دەهات بۆ لای خۆیان ڕایاندەکێشام بڕیارم دا ئـەم شـاکارە وەربگێڕمـەوە سـەر زمـانی کوردی، بۆیە لە نەوەدەکاندا وتارێکم نووسی و لەوێدا بەڵێنم دابوو ئەو ڕۆمانە بە کوردی بخەمە بەردەستی خوێنەری کورد، ئەوەبوو لە هاوینی ساڵی ١٩٩٩دا سێ پارِ (بەش)م لێ وەرگێڕا، بـەڵام لەبـەر هەنـدێك بـارو دۆخـی کـاری ڕۆژنامەنووسـی و مامۆسـتایەتی بـە شێوەیەکی کاتی دەستم لە وەرگێڕانەکە هەڵگرت و بۆ دەرفەتێکی گونجاو دەگەڕام درێـژە بە وەرگێڕانەکە بدەم و بەڵێنەکـەم بـەدی بهێـنم، ئـەوەبوو ئـەم سـاڵ ئـەو دەرفەتـەم بـۆ هەڵکـەوت و قۆسـتمەوەو لـە کۆتـایی مـانگی تـشرینی دووەمـدا تـوانیم ئـەم شـاکارە وەربگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، هەر بەو مەبەستەیش خوێنەران لە ناسینی ئـەم ڕۆماننووسـە بێبـەش نەکـەم بـە دوای زانیـاری زۆرتـردا گـەڕام و کورتەیـەك لـە ژیـان و بەسەرهاتی ئەم ڕۆماننووسەم ئامادە کرد، لێرەدا دەیخەمە بەردەستی خوێنـەرانی بـەڕێز، هـەروەها دوا بـە دوای ئـەو ڕۆمانـە ڕۆمـانێکی دیکـەی نووسـەرم دەسـت کـەوت و خوێندمەوەو بڕیارم دا ئەویش بخەمە بەرچاوی خوێنرانی خۆشەویـست کـە بـە ناونیـشانی (گۆڕەپانی نەفرەتی)یە، ئەو ڕۆمانـەی هەنووکـە لەبـەر دەسـتتاندایە، بـە هیـوای ئـەوەی توانیبێتم خزمەتێکم بە وشەو کتێبخانەی کوردی کردبێت.

ئیڤۆ ئاندریچ یەکێکە لەو نووسەرە ناودارانەی کە بە پێشەنگی نووسـەرانی سـێرب و یۆگۆسلاڤیای ئەوسا دێت، بـەڵکو بـەناوبانگترین و تاکـە نووسـەریشە لـە خـەڵکی نیوچـە دوورگەی بەلقان ساڵی ١٩٦١ خەڵاتی (نۆبل)ی وەرگرتووە، ئـەویش پـاش ئـەوەی تـوانی وێـژەی نەتەوەکـەی بگەیەنێتـە قۆنـاغێکی نـوێی پەرەسـەندووی شـان بەشـانی وێـژەی نەتەوەکانی جیهان، یەکێکە لەو نووسەرانەی زۆرتـرین بەرهەمـەکانی بـۆ سـەر زمامـانی

دیکە وەرگێڕراون، بەوەیش شایەنی ئەو نازناوەیە کە ڕۆژنامەی (لۆمۆند)ی فەرەنسی پێی ناوزەدکردووەو دواتر بەجیهاندا بڵاوبووەوە، ئەویش نازناوی (تەلستۆی یۆگۆسلاڤیا)یە، تا ڕادەیەك لە وڵاتەکەی خۆیدا بە مێژووی قۆناغێکی وێژەیی دیاریکراو دادەنرێت، تا وای لێهاتووە بڵێین وێژەی پێش ئاندریچ و وێژەی پاش ئاندریچ، ئەویش لەناکامی ئەوەی کە ئەو ڕوانینە ڕیالیزمییانە فەلسەفییەی لە وێژەدا دەستەبەر کردووەو توانیویەتی ڕووداوە ناوخۆییەکان بە بەرگی ڕووداوی جیهانیدا بکات، بە تایبەتی لە قۆناغی پاش دووەمین جەنگی جیهانی.

(نیڤۆ ئاندریچ) لە ٩ی ئوکتۆبەر - تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٩٢ لە گوندی (دۆلاتس)ی سەر بە شاری ترافنیك لە کۆماری بۆسنیاو هەرزەگۆڤینا لەدایك بووەو لە ١٣ی ئاداری ١٩٧٥ لە شاری بەلگراد کۆچی دوایی کردووە، بەبنەچە (کرواتی)یە، بەڵام دوای کۆتایی هاتنی دووەمین جەنگی جیهانی ڕایگەیاندبوو کە (سیربی)یە. کوڕە کرێکارێکی ساکار بووە، کە ژیانی مەمرەو مەژی بۆ خێزانەکەی دەستەبەر کردووە. هەرکە نیڤۆ دەبێتە دوو ساڵان باوکی کۆچی دوایی دەکات، بۆیە دایکی ناچار دەبێت ڕەوانەی لای خزمەکانی بکات لە شارۆچکەی فیشیگرادو لەوێ خوێندنی سەرەتایی دەخوێنێت و هاوینان دەهاتەوە کاری دەکردو داری دەبڕییەوە، زۆر بە زەحمەت توانی خوێندنی ئامادەیی لە سەرایێڤۆ تەواو بکات.

لەو کاتەوەیش تا دەهات بارودۆخی بەرەو باشی دەچوو، بۆیە وێژەی لە چەند کۆلێژێك لە (زەغرب)ی پایتەختی یۆگۆسلاڤیاو ڤییەنای پایتەختی نەمساو شاری کراکۆف لە پۆڵەندە خوێندو، بڕوانامەی ماجستێرو دواتر دکتۆرای لە زانکۆی (گرانتس) لە نەمسا وەرگرت. پاشان چووە ڕیزی کاری دیپلۆماسییەوەو بوو بە کونسوڵ و باڵیۆزی وڵاتەکەی لە گەورەترین پایتەختەکانی ئەوروپا لەوانە: ڕۆما، بوخارست، گراتس، مەدرید، برۆکسل، پاریس، جنیڤ، بەرلین. لەو پایتەختانە شارەزای ژیانی ڕاستەقینەی ئەوروپا بوو، کە بە خۆی قۆناغی منداڵیەتی و گەنجی خۆی بەو شێوەیە بەسەر برد کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەژێر داگیرکاری دەستەڵاتی عوسمانلی، دواتر دەوڵەتی نەمسا —

مەجارستاندا بوو، بۆیە ئەو وڵاتە وای لێهات لە ڕووی نەریت و هەڵس و کەوتەوە لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات بچێت، ئەگەرچی بە کردەنی لەناوەندی ئەوروپادا بوو.

چالاکییەکانی ئیڤۆ ئاندریچ لەو کاتەوە دەستیان پێکرد کە ساڵی ١٩١٤ قوتابی زانکۆ بوو ئەویش بە شیعری ویژدانی، ئەو کاتە پەرتووکێکی بە ناونیشانی (هەڵبژاردە لە شیعری ئەفسانە) بڵاوکردەوە. لە ساڵی ١٩١٨ یەکەمین کۆشیعری خۆی بە ناوی (ئیکس پۆ) بڵاوکردەوە کە یەکەمین بەشی لە بەندیخانە نووسی، دووەمین و سێیەمین بەشیشی ئەو کاتە نووسی کە ئازاد کرا. ئەو ماوەیەی کە لە بەندیخانەی بەسەربرد زۆری کار لە دەروون و ویژدانی کرد. ساڵی ١٩٢٠ دووەمین کۆشیعری خۆی بە ناونیشانی (نیگەرانی) بڵاوکردەوە. دواتر ڕووی کردە نووسینی پەخشان. بۆیە هەمان ساڵ ١٩٢٠ کۆچیرۆکێکی بە ناونیشانی (ڕێگەی عەلی گەرەز لاز) بڵاوکردەوە، عەلی کابرایەکی مووسوڵمانەو نووسەر وای وێنە دەکێشێت کە پاڵەوانێکی ئازایەو خەڵك لێی دەترسن. بەڵام ئەوەندە ناخایەنێت ئافرەتێکی خۆش دەوێت، لێرەشدا سەری لێدەشێوێت و نازانێت چی بکات و، دەپرسێت بۆچی ناتوانێت بچێتە ناو دڵیەوە، بۆچی ناتوانێت ئەو کارە بکات کە هەموو پیسکەیەکی هەڵخەڵەتێنەر دەیکات؟ نووسەر مەودای دوورتر بە پاڵەوانەکەی دەبەخشێت ئەگەرچی تەنیا لە ناوچەی بۆسنیادا دەگوزەرێنێت. ئاندریچ کەسایەتی پاڵەوانەکەی لە ناوەوەو لە دەرەوە ڕووناك دەکاتەوە، ئەوەیش بە نەریتەکانی کۆمەڵە ڕۆژهەڵاتییەکەیەوە دەبەستێتەوە، کە ئادەمیزادانی سەر بەهەر سێ ئایینی ئیسلام و کریستیان و جوولەکەی تێدا دەچین، هەمان کات دەیکاتە مرۆڤێکی مەودا گشتی و، لە ویژەی جیهانی نزیك دەکاتەوە کاتێك پیاوەکە بە گشتی تووشی کێشەی هەمیشەیی دەبێت کە بەردەوام بەرانبەر بە ئافرەت تووشی دەبێت، ئەگەرچی لە ژینگە سنووردارەکەی خۆیەوە هەنگاو دەنێت. پاشان ئیڤۆ ئاندریچ سێ کۆچیرۆك بڵاو دەکاتەوە ئەویش لەساڵانی ١٩٢٤و ١٩٣١ و١٩٣٦، پاشان کتێبی (چیرۆکی نوێی کورت) ساڵی ١٩٤٨ و کۆچیرۆکی (ڕوو) ساڵی ١٩٦٠ بڵاو دەکاتەوە. لەو ماوەیەشدا دەست بە نووسینی وتاری ڕەخنەیی و لێکۆڵینەوە دەکات و وتار لەبارەی نیگۆش و کراگیچ و گۆیا

و سیمۆن بۆلیڤارو وەڵت وایتمان و ستراندنبیرگ و گۆیاچیچ و باریف و مەدیڤید و مۆرن و هی دیکە دەنووسێت.

ڕۆمان فرەوانترین بواری داهێنانی نیڤۆ ئاندریچ بوو، بازووی خۆی لەم بوارەدا هەلکردبوو، سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنابوو ئەگەرچی ڕۆمانگەلێکی زۆری نەنووسیوە، چونکە تا ساڵی ١٩٤٩ تەنیا سی ڕۆمانی نووسیبوو کە بریتی بوون لە: (ڕووداوەکانی شاری ترافنیك) و (پردەکەی سەر ڕووباری درینا) و (قەیرە)، ساڵی ١٩٥٤یش ڕۆمانی (گۆڕەپانی نەفرەتی) بلاوکردەوە. سەرجەم شاکارەکانی، سەرەڕای ئەو دە کتێبەی کە ساڵی ١٩٦٣بەسەرپەرشتی خۆی هەڵبژێررابوون و ڕێك خرابوون، پاش کۆچکردنی لەیەك بەرگدا بلاوکرانەوە، ئەو بابەتانەیشیان لەخۆگرتبوو کە پاش خۆی بەجێی هێشتبوون لەوانەیش کۆچیرۆکێك بەناونیشانی (ماڵێکی دوورە دەست)، لەگەڵ کۆچیرۆکێکی دیکەدا بە ناونیشانی (چەند نیشانەیەکی سەر ڕێگە) کە مۆرکی قووڵبوونەوەو فەلسەفەی لەخۆ گرتبوو، لەگەڵ پەرتووکێکی (شیعری ویژدانی) و پەرتووکێکی وتارو لێکۆڵینەوەو یادداشتی نووسەرو ڕۆمانێك بە ناونیشانی (عومەر پاشا لاتاس) کە تەواوی نەکردبوو.

ژیانی نیڤۆ ئاندریچ چەندین ئەزموونی دژوارو قۆناغی کولەمەرگی و نەداری و هەناسەساردی بەخۆوە بینیبوو، ئەوەبوو ژیانی کولەمەرگی لە فیشیگرادو سەراییڤۆو زەغرب و ڤییەناو کەراکۆف بەسەربردو، ژیانی کولەمەرگی ناو بەندیخانەیشی بینیبوو کاتێك لەسەردەمی داگیرکاری نەمسا-مەجارستاندا بە تاوانی پێوەندی کردن بە لاوان و هاندانیان بۆ شۆڕش و ڕاپەڕین بەند کرا. دواتر کە ئازاد دەکرێت ناچاری دەکەن لەدەست بەسەریدا ببات، ئەوێك کە لە ناوچەیەکدا دەیگوزەراند کە ماوەی پێنج سەدە لەژێر داگیرکاری عوسمانلیدا بوو، پاشان کەوتە ژێر داگیرکاری نەمساو مەجارستان، ئەو ناوچەیەی بەردەوام لانکەی گرژی و نیگەرانی و ناسەقامگیری بوو، ئەو کاتەی کە کۆماری بۆسنیا بنکەی ململانێی نێوان هێزە زلهێزەکان بوو لەبەر ئەوەی لە ئەورووپاوە نزیك بوو، لە ناوەندو پایتەختی دەوڵەتی عوسمانلیشەوە دوور بوو. بۆیە شتێکی ئاساییە ڕۆمانەکانی

ئیڤۆ پڕ لە قەشەی کاسۆلیك (لە کاتێکدا خۆی ئۆرسۆزۆکسی بوو) و پاشاو فەرمانڕەواو سوڵتان و تاوانکارو دزو جەردەو ئەفسەر بن و، چیرۆکەکانیشی کەسایەتی کریستیان و مووسوڵمان و جوولەکەیان تێدا بوو، کەسانی دەوڵەمەندو خۆسەپێن و نەداریان تێدا بوو. هەموو ئەوەیشی تێکەڵ بە داهێنانێکی سەرقاڵی ئارەزووکارانەی مێژووی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری نیوچە دوورگەی بەلقان دەخستە ڕوو، کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە سەر خاکی بۆسنیای دەدەبڕی، کە بە شێوەیەکی درامیانە هەموو شتە ئایینی و سیاسییە ناکۆکەکانی لەناو ئەو خاکەدا بەرجەستە کردبوو، لەو شوێنەی کە خۆشگوزەرانی تێدا لە بەشەکانی دیکەی ئەورووپا لە ئاستێکی نزمتردا بوو، ئەو شوێنەی کە چەندین مەرجی بابەتیانەی هێنایە کایەوە کە کاریگەرترە لە ڕوانینی درامیانەی چارەنووسی ئادەمیزاد. چونکە زۆربەی پاڵەوانەکانی تووشی کارەسات و کولەمەرگی دەبن و خۆیان لەبەردەم چارەنووسێکی ڕەق و سەخت و ترسێنەردا دەبینییەوە کە ناتوانن خۆیان لەچنگی قوتار بکەن، لەبەر زەبرو زەنگ بەنیوچە ناتەوان بەرانبەری ڕاوەستاون، بێ ئەوەی ملی بۆ کەچ بکەن، بەڵکو دیانبینیت بەوپەڕی تواناکانیانەوە کە لە توانای ئەو چارەنووسە بێهێزترە بەرەنگاری دەبنەوە، تا ڕادەیەك وا پێدەچێت بەردەوام چارەنووسی سەرکەوتوو بێت، بێ ئەوەی بتوانێت بەسەر کۆشش و خەبات و سەربەرزی مرۆڤدا زاڵ بێت، ئەگەرچی کۆتایی هەر مردنەو هەموو مرۆڤێك لەچارەی نووسراوە بمرێت.

پرسی مەتەڵی ئادەمیزاد، لە چوارچێوەیەکی مێژوویی تایبەتەوە لە سەردەمی دوو داگیرکاری کوشندەی یەك بە دوای یەکدا لە گۆڕەپانی بەلقانەوە دەستی پێکردووە، کە بە زنجیرە بابەتێکی هونەری ئاڵۆز دەربڕیون. ڕوو بەڕەووبوونەوەی نێوان ڕاستی و خەیاڵ، واقیع و خەون، ڕاستی و ئەفسانە، جیهانی ناپاکی مێژوویی خۆڕسکی ناخی مرۆڤ و جیهانی نەریت و بەها مرۆییەکان کە ئاواتیان بۆ دەخوازرێت، ئەوانەی لێدەدرێن تا سەربڵندی خۆیان لەدەست دەدەن. ئەم بابەتانە لە یەکەمین چیرۆك و کارە هونەرییەکاندا سەریان هەڵداوە وەك ڕێگەی عەلی جەزەر لاس و مستەفای مەجەری و کوێریەو ئافرەتە ئەڵمانییەکە، یان زنجیرە چیرۆکە کورتەکان سەبارەت بە قەشەکانی بۆسنیا کە دەیانبینین

لە شاکارە گەورەکانی دواتری(ئیڤۆ ئاندریچ)دا لە ڕووی شێوەوە پەرە دەستێنن: وەك ڕووداوەکانی شاری ترافنیك و فیشیگراد، وەك شێوەیەکی تایبەتی گۆڕاو کە لە چوارچێوەی چەند چیرۆکێکی دەروونی و مێژووییدا خراونەتە ڕوو.وەك پردەکەی سەر ڕووباری درینا و، قەیرەو، لە گۆڕەپانی نەفرەتیدا، کە بەهێلێکی هاوتەریبدا بەرەوپێش دەچن بەوەی ڕۆمانێکی مێژوویی فەلسەفی هاوچەرخن.

ڕۆمانی (ڕووداوەکانی شاری ترافنیك) ڕۆمانی شارە، کە نووسەر بە ناوەندی هەلکردنی بای ململانێی سیاسی و داینەمۆی شۆڕش و شەڕو داواکردنی ئازادی لە ئەوروپا وێنەی دەکێشێت، لەوێ ململانێی توندی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دەبینین. جا لەبەر ئەوەی ئەو شارە بنکەی تورکەکان بوو کاتێك فەرمانڕەوایی ئەو ناوچانەی یۆگۆسلاڤیای ئەوسایان دەکرد، بۆیە ژیانێکی هێوری ڕۆژهەلاتیانەی خۆپارێزی بەسەر دەبرد، کە شارێکی دووری پشت گوێ خراو بوو، تا ئەو کاتەی کونسولخانەی تێدا کرایەوە لە ئاکامی بایەخ پێدان و ململانێ کردن لەپێناوی کۆنترۆڵ کردن و دەست بەسەردا گرتنی. ئەوەبوو یەکەمین جار کونسولخانەی فەرەنساو دواتر کونسولخانەی نەمساو ولاتانی دیکەی تێدا کرایەوە. لەوێ ململانێ لە نێوان کونسولی فەرەنساو نەمسا بە شێوەی جیاجیا دەستی پێکرد، ئەو ململانێیەی کە چاوچنۆکی و بەرژەوەندی نێو دەولەتی لە خۆیدا شاردبووەوە، ئەگەرچی بە ڕوالەت سەرگوزشتەی نێوان دوو بالیۆزە، نەریت و ڕەفتاریان جیاوازە، لە کاتێکدا فەرەنسییەکە ڕۆشنبیرەو ئەلمانییەکە پابەندی ڕێك و پێکی و سستمە. تا ڕادەیەك هەر یەکەیان خۆی گۆشەگیر دەکات ئەویش لە کەش و هەوایەکی پڕ دلڕەقی و نەزانیندا، بەلام لەبەر ئەوەی هەردووکیان سەر بە یەك بلۆك یان سەربازگەن و، دژ بە سەربازگەی ڕۆژهەلاتن، بۆیە ئەو هۆیە لێکیان نزیك دەکاتەوە، ئەگەرچی هەردوو لایان وریایی بەرانبەر یەك دەنوێنن کە هەر یەکەیان خۆیانی پێ دادەپۆشن، ئەمەیش ڕووداوەکان وا لێدەکات بە شێوەیەکی گالتەجاڕانەو سەیرو سەمەرە بێنە بەرچاو.

پردەکەی سەر ڕووباری درینا، خۆی لە خۆیدا داستانێکە، چوار سەدە لە ژیانی شاری فیشیگراد دەگێڕێتەوە، ئەو پردەی کە محەمەد پاشا سۆکۆلڤیچ لە سالی١٥٧١دا دروستی

کردووە شانۆی ڕاستەقینەی هەر هەموو ڕووداوەکانە ئەگەرچی ئەو ڕووداوانە ئەوەندە زۆرو زەبەندەو لێك جیاوازو دژ بە یەکن، تا ڕادەیەك وایان لێهاتووە پردەکە وەك بڵێیت تەنیا پێوەندییە ئەوە دوای ئەوە خەڵکی شارەکەو داگیرکارەکانیان و سەردەمەکانیان پێکەوە دەبەستێتەوە لە ڕێگەی هەموو ئەو ڕووداوانەی لەسەر پردەکە روویان داوە، بۆیە چەند شارو خەڵك و فەرمانڕوایان و ڕووداوەکان بگۆڕێن، ئەوە تەنیا شتێك کە ناگۆڕێت و بە نەمری دەمێنێتەوەو دەبێتە گەواهیدەری هەموو سەردەمەکان پردەکەیە.

زۆربەی بابەتی نووسراوو بەرهەمە ئەدەبییەکانی ئیڤۆ ئاندریچ لەبارەی بۆسنیاوەیە، باسی مێژووی ئەو وڵاتە دەکات لە سەرەتای داگیرکاری تورکەوە تا ئەم سەردەمە، باسی شارو گوندو دیمەن و دانیشتووانی بۆسنیا دەکات چ تورك و، سلاڤی موسوڵمان و، سیربی ئەرسۆزۆکس و کرواتی کاسۆلیك و، قەشەی فرنسیسکانی و، جوولەکەو، ئەفسەرانی نەمساوی و، چەتەو،... تاد هەروەها ڕەفتارو نەریت و، ئەفسانەو، جەنگ و، هیواو ئاوات و، ڕقە توندو ئارەزووە لەڕادەبەدەرەکانیان وێنە دەکێشێت.

(پردەکەی سەر ڕووباری درینا) بە لووتکەی شاکارەکانی ئیڤۆ ئاندریچ دادەنرێت، نووسەر لەسەر ئەم ڕۆمانە گەورەترین خەڵاتی وێژەیی وەرگرتووە کە لە یۆگۆسلاڤیا دەبەخشرێت، ئەو پردە بەردینە بەناوبانگەی لەسەر ڕووباری درینا لە شاری ڤیشیگراد دروست کراوەو مەبەست لە دروست کردنی ئەوە بووە بۆسنیاو سیربیا پێکەوە ببەستێتەوە، کە ئەو کاتە دوو هەرێم لە هەرێمەکانی ئەمپراتۆریەتی عوسمانلی بوون، ئەم پردە کەسایەتی سەرەکی ئەم چیرۆکەیە کە باسی مێژووی ئەو وڵاتە لە سەدەی شازدەمەوە تاساڵی ١٩١٤ دەکات، ئەم پردە کە ئیڤۆ ئاندریچ وا باسی دەکات کە (لە جوانیدا نموونەی نییە)و مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێت ئەو پردە لەو شارۆچکە دوور دەستەدا دروست کرابێت، ئەو تەوەریە کە بەشەکانی ڕۆمانەکە پێکەوە دەبەستێتەوەو یەکیان دەخات، چونکە ئەو پارە جۆراوجۆرانەی کتێبەکەیان لێ پێکدێت چەندین چیرۆکن هەر هەموویان پێوەندییان بە پردەکەی دریناوە هەیە.

ئەم پردە سالّی ١٥٧١ بە فەرمانی گەورە وەزیر (واتە سەرەك وەزیران ـ م. ت) محەمەد پاشا سۆكۆلۆڤیچ دروست كراوە كە لە گوندێكی بچووكی گوندەكانی بۆسنیای نزیك بە فیشیگراد لە دایك بووە.

نووسەر لە دووەمین پاری كتێبەكەیدا باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە چۆن ئەم مندالّە بۆسنییە لە چنگی دایك و باوكی دەرهێنرا لەگەلّ ئەو مندالانەی دیكەی ولات بە ناوی باجی خوێنەوە بە زۆر دەرهێنران، بۆ ئەستەمبولّ برا، لەوێ بوو بە موسولّمان و، بوو بە ئەفسەرێكی تورك، دواتر بوو بە وەزیرێكی ناوداری دەستەلاتدار. مرۆڤ ناتوانێت فرمێسكەكانی خۆی رابگرێت كاتێك دیمەنی ئەو دایكە تۆقیوانە دەبینێت كاتێك مندالّەكانیان بەرێ دەكەن كە سەربازانی تورك لە ئامێزیان رفاندوون و دەریانهێناون و بۆ شوێنێكی دووریان دەبەن.

لە سێیەمین و چوارەمین پاریشدا نووسەر باسی مێژووی دروستكردنی پردەكەمان بۆ دەگێرێتەوە، باسی ئەو جۆرە ئازارو ئەشكەنجانەمان بۆ دەگێرێتەوە كە لە كاتی دروستكردنی پردەكەدا بەسەر سوخرەكاران لە دانیشتووانی شارەكەدا سەپێنراوە لەگەلّ ئەو زولّم و زۆرەی عابد ئاغا لێی دەكردن كە وەزیرەكە رایسپاردبوو سەرپەرشتی دروستكردنی پردەكە بكات، كە پیاوێكی تۆقێنەرەو لە پشت پەردەی دلّرەقیشەوە ئانەمینی خۆی شاردبووەوە. نووسەر باسی ئەو وێرانكارییەمان بۆ دەكات كە رادیسلاف ئەنجامی دان و، چۆن پێی زانراو، دەستگیر كراو، لە قازووخ درا. باسكردنی ئەو ئەشكەنجەیەی رادیسلاڤ مووچركەیەكی تۆقێنەر بە لەشی مرۆڤدا دێنێت.

رووداوەكانی رۆمانەكە بە درێژایی سەدەكان بەردەوام دەبن و زۆر جیاوازو جۆراجۆرن، بەلام بەردەوام بە پردەكەوە پەیوەستن: كارەساتی لافاو، رووداوەكانی یاخیبوون، دەردو پەتا، داگیركردنی بۆسنیا لە لایەن سوپای نەمساو مەجەرستانەوە سالّی ١٨٧٨و ئەو گۆرانانەی ئەم داگیركردنە هێنانیە گۆرێ (گۆرانی ئابووری جۆراجۆرو راكێشانی هێلّی شەمەندەفەر كە كەمێك لە پلەو پایەی پردەكەی كەمتر كردەوە)، بزووتنەوە كۆمەلایەتییەكان، شەرەكانی بەلقان، سەرهەلّدانی نەوەی نوێی شۆرشگێر، پاشان

کوژرانی ئەرشیدۆق فرانتس فردیناند ساڵی ١٩١٤و، هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان سیرب و نەمساو مەجارستان و تەقاندنەوەی پردەکە.

ئەمە هەر هەمووی مێژووە. بەڵام مێژوویەکە لە کتێبەکەدا تێکەڵ بە درامای سۆزداری و، کارەساتی خێزان و، ڕووداوی خودی دەبێت، وەك بڵێیت ڕووداوە مێژووییەکان تەنیا بیانوون و نووسەر دەیەوێت بە هۆیانەوە ناخی ناخەوەی مرۆڤایەتی وێنە بکێشێت، تەنانەت کاتێك چیرۆکەکان دەخوێنیتەوە کە پردەکەی درینا پێکەوەیان دەبەستێتەوە خەیاڵت بۆ ئەوە دەچێت کە ئەمانە خەیاڵن و لە واقیعەوە دوورن. لە ڕاستیدا جیاکردنەوەی ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانە لە نێوان ئەوەی واقیعەو ئەوەی خەیاڵە کارێکی ئاسان نییە، بەڵام لێرەدا خەیاڵ زۆر توند تێکەڵاوی مێژوو دەبێت، لەودیوی هەر بەسەرهاتێکەوە ڕووداوێکی واقیعی یان ئەفسانەیی هەیە خەڵکەکە لەمەڕ ڕووداوێکی واقیعی گواستوویانەتەوە، لەم ڕووەوە کتێبەکە گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی بەڵگەنامەی مێژوویی لەخۆ دەگرێت. بەڵام هەرچۆنێك بووە یەکەمین خەسڵەتی ئەوەیە کە شاکارێکی ئەدەبییە نەك ڕۆمانێکی مێژوویی. تەنانەت لە لایەنی مێژووشەوە مێژووی دەروونی تاکەکانە بەرانبەر بە ڕووداوەکانی مێژوو پتر لەوەی گێڕانەوەی ئەم ڕووداوانە بێت. ڕووداوەکان لێرەدا هیچ بەهایەکی ئەوتۆیان نییە تەنیا لەوەدا نەبێت کە بارودۆخی دەرەکین دەروونی تاکە کەسانیان بە ئاکارو لایەنی کەم و کورتی و ئارەزوو و ئازارو ژان و شادی و کامەرانییەکانیانەوە تێدا بەرجەستە دەبێت.. ئێمە لەم کتێبەدا بەسەرهاتی کیژێك دەخوێنینەوە خۆی دەکوژێت بەوەی خۆی لەسەر پردی درینـاوە فـڕێ دەداتە نـاو ڕووبارەکەوە لەبەر ئەوەی بێ ئارەزووی خۆی بە مێرد دراوەو حەز لەو مێردە ناکات و لەگەڵ شان و شکۆی ئەودا هاوسان نییە... بەسەرهاتی لاوێك دەخوێنینەوە لەسەر پردەکە دراوێکی زێڕین دەدۆزێتەوە و دەچێت یاری پێ دەکات و خوو بە قومارکردنەوە دەگرێت و لەڕێ دەردەچێت... بەسەرهاتی ئاغایەك دەخوێنینەوە نەریتەکانی خۆی ناگۆڕێت و زۆر پابەندی ئایینەو لە داخی گۆڕانی نەریت و حوکم کردنی خوانەناسان خەفەت دەخوات... بەسەرهاتی سەربازێکی لاو دەخوێنینەوە کە کیژێك فریوی دەدات

کاتێك پاساوانی پردەکە دەکات بۆ ئەوەی چەتەیەك تێپەڕێنێت، بۆیە مەرگ بە باشتر لـە هەسـت بـە ڕیـسوایی فریـودان و ڕیـسوایی ئـەرك بەجێنـەهێنان دەزانێـت... هـەروەها بەسەرهاتی لاوێکی ڕۆشنبیری بە ئاوات و لە خۆبایی و بایەخ بەخۆدەر دەخوێنینـەوە کـە بایـەخ بـە شـتی دیکـە نـادات تـەنیا ئـەوە نـەبێت کـە نێرگسییەتی خـۆی بەسـەریدا دەسەپێنێت، ئەو تەنانەت بەوەیشەوە ناوەستێت کیژێك هەڵدەخەڵـەتێنێت و فریـو دەدات کە بە وەفادارییەوە خۆشی ویستووە، لەبەر ئەوەی تەنیا خۆی خۆش دەوێت.

ئیڤـۆ ئانـدریچ چـەند چـووەتە نـاخی مرۆڤایەتییـەوەو چـەند بلیمەتانـە وێنـەی سایکۆلۆژیانەی دەم و چاوەکانی گرتووە!

ئـەو کەسـایەتییانەی وێنـەی کێـشاون ژ بـیر ناچـنەوە. نـەك هـەر نموونـەی مرۆیـی زیندوون، چونکە وێژە کاری بە نموونەکانەوە نییە، بەڵکو ئەوانە تاکە کەسانێکن نووسـەر ئەوەندە وردو قووڵ و ڕاستگۆیانە وێنەیان دەکێشێت کە تۆ هاوکات بەچاوی دیدەو چاوی هـزر دەیانبینیـت، پاشـان لـە نـاو خـەیاڵ و ئەندێـشەتدا تـا هەتایـە دەمێننـەوە.، هـیچ خەسڵەتێکیان لێ کەم نابێتەوەو، ڕەنگێکیشیان کاڵ نابێتەوە.

پاشان کتێبەکە، سروەی خەفەتبارانە هەڵدەمژێت و، هەڵویـستێکی تێـدا لـە بـارەی بوون و ژیانەوە دەردەبڕێت هەڵویستی ڕەشبینی ئاسایی نییە، بـەڵام هەرچۆنێك بـووە هەڵویستی ئەو کەسەیە کە ناتوانێت تەنیا ئەوە نەبێت هەست بکات کە ژیان و بـوون بـە خۆیان (جۆرە شەڕێکیان تێدایـە)، شـەڕێك کـە پاسـاو نادرێتـەوەو کـەس تێـی ناگـات و هۆیەکانیشی نازانرێـت. هەڵبـەت ژیـانی خـودی پردەکـە، کـە کەسـایەتی سـەرەکی ئـەم کتێبەیە، ڕەنگە هیمایەکی ئەم تێڕوانینە پەژاراوییـەی تێـدابێت. نووسـەر پێدەکـەنێت و خەڵك دێنێتە پێکەنین، بەڵام لە ناو قاقای پێکەنینەکەیدا هەست بە چەند ئاخ و ئۆفێکی بە ئێش و ئازار دەکرێت.

هەرچی (قەیرە)یە ئەوە ڕۆمانێکە لە چەشنی ڕۆمانەکانی (بەلزاك)، لـە هەنـدێك لاوە لـە نووسـراوەکانی دیکـەی ئیڤـۆ ئانـدریچ ناکـات. بـەڵام نووسـەر وەك ناسـراوە بیرتیـژی و شیکردنەوەی قووڵی تێدا نواندووە. بەسەرهاتی کیژێکی بە نژاد خەڵکی سـەرایيڤۆیە، لـەناکاو

دەگۆڕێت پاش کارەساتێك کە تووشی باوکی دەبێت، ئەو کات دەبێتە مرۆڤێکی ڕەزیل و پیسکەو ڕقی لە ئادەمیزادان دەبێتەوەو، بە شێوەیەك دەژێت تا دێت گۆشەگیرتر دەبێت. کیژەکە دەمرێت و بارودۆخی مردنەکەی دەبێتە ڕازێك تا کۆتایی ڕۆمانەکە دەکێشێت.

ڕۆمانی قەیرە لە زۆر ڕووەوە ڕۆمانێکی دەروونییە پشت بە ڕووداو یان فرە دەنگی دەبەستێت، بە ناوی قەیرەی لێناوەو پاڵەوانەکەی کچێکە بە ناوی (ڕایکا) بە منداڵی ڕووداوێك کاری تێدەکات کە تووشی باوکی بووە، کاتێك باوکی فێڵی لێدەکرێت و فریو دەخوات و ناوی لەناو خەڵکیدا دێتە زڕین و تەنیا و گۆشەگیر دەبێت، تا بە بێزراوی نەداری دەمرێت و ئیفلاس بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت و ماڵ و سامان و بازرگانی و زەوی و زارەکانی لەدەست دەدات، بۆیە لەسەرەمەرگدا ئامۆژگاری دەکات ئاگەی لەخۆی بێت و بەرانبەر بە خۆی و بەوانی دیکە دڵڕەق بێت و هیچ بەهاو بایەخێك بە کەس و شتەکان نەدات مادامەکێ شتەکە پێوەندی بە دراوەوە هەبێت. ئەم وشانەو ڕووداوەکەی باوکی کار دەکەنە سەر دەروننی کچەکەو برینێکی تێدەکەن کە هەرگیز چاك نەبێتەوە، بۆیە کیژێکی ڕەزیل و تاك و تەنیاو گۆشەگیرو ڕق لە دڵ و دوور لە هەموو شتێکی سروشتی و شتی خۆشی ئەم ژیانەی لێ دێتە کایەوە، ئەمەیش پاڵ بەخەڵکەوە دەنێت ناوی قەیرە لێ بنێن. ئەویش ژیانێکی وا دەگوزەرێنێت هەمووی بۆ دەستەبەرکردن و پاشەکەوت کردنی پارە تەرخان دەکات، لە هەوڵێکدا بۆ تۆڵەسەندنەوەی باوکی. نووسەر خالۆ سەرخۆشەکەی کیژەکەیش دێنێتە ناو ڕۆمانەکەوە، کە کیژەکە هەست بەوە دەکات لێی نزیکەو خۆشی دەوێت و، تەك ئەودا نەبێت هەست بە پشوو ناکات، ئەویش لاوێکی سەرپێچ و سەرسەری پێ دەناسێنێت کە لە خالۆی دەچێت، کیژەکەیش خۆشی دەوێت، کوڕەیش بە خراپترین شێوە سوودی لێ دەبینێت و پارەی لێ دەڕووتێنێتەوە، تا ڕادەیەك داواکانی کۆتایی نایەن. جا لەبەر ئەوەی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە لە کەش و هەوایەکی گۆشەگیری و تەنیاییدا ڕوو دەدەن و، کەمتر پاڵەوانەکان پێوەندییان بە دەرەوە هەیە، بۆیە دیالۆگیش لە ڕۆمانەکەدا کەمترە، بەڵام زۆرتر شیکردنەوەی سایکۆلۆژیانەو مۆنۆلۆگی ناوەوەی تێدایە. ئەم ڕۆمانەی (پردەکەی سەر ڕووباری درینا) شاکارێکی زۆر گرنگی

مرۆڤایەتییانەیە، بۆیە لەساڵی ١٩٦١دا لیژنەی بەخشینی خەڵاتی (نۆبل) لەسەر ئەم ڕۆمانە خەڵاتی (نۆبل)یان لە ئەدەبدا بە ئیڤۆ ئاندریچ بەخشی.

گۆڕەپانی نەفرەتی دوایەمین ڕۆمانی (ئڤۆ ئاندریچ)ە کە پاش پردەکەی سەر ڕووباری درینا نووسیویەتی، ئەو کاتەی پرسی بەندیخانە لە دەروونیدا بووبووە بیرەوەری و پریشکی ئاگری ئەو بەندیخانەیەی بە لاوی بەرکەوتبوو، سەرەتا بەلاوی بەندیخانەی بینی و بەرهەمی (ئیکس پۆنتۆ)ی نووسی و دواتریش کە چووە ناو تەمەنەوە (گۆڕەپانی نەفرەتی نووسی) ئەویش لە پێناوی یادکردنەوەو لەبیرنەچوونی ئەو ڕووداوە. لەم ڕۆمانەدا ڕووداوەکان بە شێوەیەکی ئالۆزتر لە بەندیخانەیەکی نەفرەتیدا لە وڵاتێکی نامۆدا ڕوو دەدەن، چوون ئەو شوێنەی چارەنووس مرۆڤی بۆ ڕادەکێشێت، چ تۆمەتبار یان بێ تاوان، بۆیە دەبینین هیچ شتێك لە ستەم کردن ناشیرینتر نییەو، پێکەوە لەو دیواری بەندیخانەوە تاوانبارو بێ تاوان و پیاوانی ئایینی و زاناکان دەبینین، لەم ڕووەوە کەسایەتی قەرەقۆزی بەڕێوەبەری بەندیخانەکە سەرهەڵدەدات، لەگەڵ ئەو شێوازی لێکۆڵینەوەیەی بۆ ڕازی کردنی فەرمانڕەوا پێڕەو دەکرێت و، هەموو ئەو کەسایەتییانە دەگرێتەوە کە سەر بە هەر سێ ئایینەکەن، نووسەر هەموو لایەن و ناخەوەی ئەو کەسایەتییە ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی ناخەوەی مرۆڤ ببینین، سەر بە هەر ئایین و ئایینزایەك بێت، بەو شاکارەیشی بەشێك لەمێژووی عوسمانلی و ململانێ لەسەر دەستەڵات دەخاتە ڕوو پاش ئەوەی (محەمەد فاتح) کۆچ دەکات و هەردوو کوڕەکەی ململانێ لەسەر تەختی پاشایەتی دەکەن، هەمووی ئەوەیش لەچیرۆکێکدا کە لاوێك لەسەر زاری قەشەیەکی بەندکراوەوە لە (گۆڕەپانی نەفرەتی)دا دەیگێڕێتەوە، کە لەبەردەم پەنجەرەکەدا ڕادەوەستێت و بیر لە مردن دەکاتەوە.

ئەمەیە جیهانی داهێنانی ئیڤۆ ئاندریچ کە جیهانی مرۆڤ و مەتەڵی ژیان و دڵڕەقی چارەنووس و بەردەوام هەست بە ستەم و چوساندنەوە کردنە کە ڕەنگە بە جەستە مرۆڤ لە ناو ببات بەڵام هەرگیز ناتوانێت گیان و خەبات و تێکۆشانی بسڕێتەوە.

سەرچاوە:

پردەکەی سەر ڕووباری درینا: ئیڤۆ ئاندریچ، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: سامی الدروبی، بەیرووت - ١٩٨٤.

گۆڕەپانی نەفرەتی، ئیڤۆ ئاندریچ، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: د. وەلید السباعی، لـە بڵاوکراوەکانی یەکیەتی نووسەرانی عەرەب، دیمەشق ١٩٩٢.

سایتی (ویکیپیدیا) لە تۆڕی ئینتەرنێت، بابەتی ئیڤۆ ئاندریچ.

# گۆڕەپانی نەفرەتی

زستانە، بەفر هەموو شتێکی داپۆشیوە، تەنانەت دەرگەی ماڵەکانیش، شێوەو ڕوخساری لە شتەکان وەرگرتووەتەوەو، تەنیا یەك ڕەنگ و یەك دیمەنی پێ بەخشیون.

لەژێر ئەم سپیایەتییەدا، گۆڕستانە بچووکەکەیش بزربووە کە هیچ شتێکی تێدا نابینرێت تەنیا خاچە بچووکەکان نەبێت کە لەناو بەفرە چڕەکەوە دیارن. تەنیا شتێك کە دەشێت لەسەرپۆشە بەفرینەکەوە جیا بکرێتەوە، ئەوە شوێنی ئەو ڕێگە تەسکەیە کە دوێنێ پاش بەرێ کردنی تەرمی قەشە پیتەر دروست بوو.

لە کۆتایی ئەو ڕێگەیەوە ڕووپێوێکی ئاونگی بۆر فرەوانتر دەبێتەوە کە شێوەیەکی بازنەیی نارێکی لەخۆگرتووە، لەچوار دەوری بەفرەکە ڕەنگێکی ئەرخەوانی شێداری قوڕاوی وەرگرتووە، لە برینێکی قەتماغەبەستووی ناو سپیاتییەکی گشتی دەچێت و، تا چاو بڕکات درێژەی هەیەو، بەشێوەیەکی نەبینراو لە بیابانی ئاسمانێکی زیویندا بزر دەبێت کە هێشتە پڕ بەفرە.

هەموو ئەوە لەناو پەنجەرەی قەشە پیتەرەوە دەبینرا، تا ڕادەیەك سپیایەتی جیهانی دەرەوە تێکەڵ بەو سێبەرە خەواڵووە بووە کە باڵی بەسەر ناوەوەی ژوورەکەدا کێشاوە، ئەو هیورییەیش تێکەڵ بە دەنگی ڕۆتینیانەی هەموو ئەو کاتژمێرە زۆرانە بووە کە هێشتە کار دەکەن، کەچی هەندێکیان ڕاوەستاون چونکە کۆك نەکراون. هیچ شتێك ئەو کپییەی تێك نەداوە تەنیا ناکۆکییەکی هێوری نێوان دوو قەشە نەبێت کە ڕاوەستاون و ئەو شتانە دەژمێرن کە قەشەکە لەپاش خۆی بەجێی هێشتوون.

پیرە قەشە میۆ یۆسیچ چەند وشەیەکی لەزار دێنە دەرێ کەس تێیان ناگات، کە دەنگدانەوەی ناکۆکییەکانی پێشووی ئەو لەگەڵ خوالێخۆشبوو قەشە پیتەردا، کە

سەعاتچی و تفەنگ چاککەرەوەو میکانیکییەکی بەناوو دەنگ بوو، بەوپەڕی ئارەزووەوە هەموو ئەو ئامێرانەی کۆکردبوونەوە کە پارەو سامانی دێرەکەی لە پێناودا خەرج کردبوون و، بەوپەڕی بەتەنگەوەبوونەوە پاراستبوونی. پاشان سەرزەنشتی قەشەی لاو ڕاستی سلاڤ دەکات کە پێشنیاری کرد سۆپەکە دابگیرسێنێت تا شتە بەجێ ماوەکان لەژوورێکی سارددا نەهێنە ئەژمارتن.

ـ ئای چ لاوێکی بەستەزمان بوو! ئێوەی لاو هەر هەمووتان بەو شێوەن. وەك خاتوونان سەرما لە ئێسکەکانتاندایە. ژوورێکی گەرم و گوڕت دەوێت!! وەك بڵێیت هەموو ئەوەی ئەم زستانە خەرج کران و سووتان کەم بوون!

وا پێدەچوو پیرەکە بەم سەرزەنشتەی سەرزەنشتی خوالێخۆشبووی دەکرد کە هێشتە خۆڵی سەر گۆڕەکەی پەرت نەکراوەتەوە. بێ دەنگی. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند درێژەی بە سەرزەنشتی کردنی لاوەکە دا.

ـ بەردەوام دەڵێم: تۆ ڕاستی سلاڤ نیت، بەڵکو ڕاسبی سلاڤ! (ڕاستی بە سێربی واتا دلێر، راسبی پێچەوانەیەتی) تەنانەت ناوەکەیشت ئاماژە بە شتێکی باش ناکات. پێشتر قەشەکان ناوی دیکەیان هەبوو وەك قەشە مارکۆ، قەشە میۆ، قەشە ئیڤۆ، کە سەردەمێکی باش بوو، ئەمڕۆ دەتانبینین لە ڕۆمانەکانەوە ناو وەردەگرن. لە کوێوە ناوی قەشە ڕاستی سلاڤ، یان فۆیسلاڤ، یان برانی میرت هێنا، کە بە ڕاستی ئەوە لەگەڵ ئێمەدا ڕوو دەدات؟

قەشە لاوەکە گوێ بەم سەرزەنشتی و تێبینییانە نادات کە سەدان جار بیستوونی و، خوایش دەزانێت چەندین جاری دیکەیش دواتر دەیانبیستێت. کار بەردەوام بوو.

ئەو پیاوانەی، کە ئەمڕۆ پاش مەرگەکانی خوالێخۆشبوو دەژمێرن کە تەنیا پێش دوو ڕۆژ لێرە زیندوو بوو، وەك چۆن ئەوان زیندوون، شێوەیەکی تایبەتیان هەیە. ئەوانە نوێنەرانی ڕەوتی سەرکەوتووی ژیان دەکەن کە هەنووکە بەدوای شتە پێویستییەکانیدا بەرەو پێشەوە دەچێت، نەك ئەو سەرکەوتووە داهێنەرانە. کەواتە هەموو بەهرەکانیان بە کورتی لەوەدایە کە لە خوالێخۆشبوو پتر ژیاون. کاتێك مرۆڤ لە لایەکەوە چاودێرییان

دەكات وەك ڕفێنەر دێنە پێش چاو. ڕفێنەرانێك كە بەڵێنیان پێدراوە هیچ سزایەك نەدرێن، لەوە دڵنیان كە خاوەندی پاشەرگەكە ناگەڕێتەوەو، لەناكاودا بەژووردا ناكات و بەسەرقاڵی بیانبینێت. ئەوان تەواوەتی بەو شێوەیە نین، بەڵام بەشێوەیەك لە شێوەكان بیرت دەخەنەوە.

- بنووسە.

قەشە پیرەكە بە دەنگە ناخۆشەكەی گوتی:

- بنووسە یەك پەنگرگری گەورە، مووكێشێك...

ئیدی بەم شێوەیە، نامێر لە دوای نامێر. لە كۆتایی نووسینی هەموو ڕستەیەكدا دەنگی زرم و هوڕی ئەو ئامێرە بەرگوێ دەكەوت كە تۆمار دەكراو، فڕێ دەدرایە سەر هەموو ئەو ئامێرە پەرت و بڵاوانەی فڕێ درابوونە سەر ئەو مێزەی قەشەی خوالێخۆشبوو كە لە داربەڕوو دروست كراوە.

كاتێك مرۆڤ بەم جۆرەیان دەبینێت و گوێی لێیان دەبێت، بە خۆڕسكی هەموو شتێك لە ناخیدا لە ژیانەوە بەرەو مردن دەبێتەوە، لەوانەی شتەكان دەژمێرن و شتەكانی ئەو كەسە دەبێتە موڵكیان كە هەموو شتێكی لەدەست داوەو، چی دیكە پێویستی بە هیچ شتێك نییە چونكە بە خۆی نەماوە.

***

تەنیا بەر لە سێ ڕۆژ، لەسەر ئەم كەنەبە پان و بەرینە ڕادەكشاو دادەنیشت و دەپەیڤی كە نوێن و سەرپۆشەكەی لەسەر لادراوەو، هیچی نەماوە تەنیا تەختە دارە ڕووتەكانی نەبێت. ئێستە، لەكاتێكدا لاوەكە لەناو بەفرەكەوە تەماشای گۆڕی خوالێخۆشبوو دەكات، بیر لە قسەكانی دەكاتەوە، دەیەوێت سێیەمین و چوارەمین جار بڵێت كە چۆن گۆساغ بوو و قسانی دەكرد، بەڵام ئێستە ناتوانرێت ئەو شتە بگوترێت.

لە دوایەمین هەفتەدا زۆر دەپەیڤی، قسەكانیشی پتر لەبارەی ئەو سەردەمەوە بوون كە لە ئەستەنبوڵ دەژیا. پێش ماوەیەكی دوورو درێژ. لەبەر ئەوەی قەشەكان، بە هۆی كاری سەخت و دژواریانەوە، قەشە (تادی ئۆستۆیچ)یان ڕەوانەی شاری ئەستەنبوڵ كرد،

ڕاسپێرراوی پێشوو، ژمێریاری پێشوو، (پیاوێك بوو تێکەڵ بە پێشوو)! پیاوێکی سست و بەڕێزو شەیدای سستی و بەڕێزی خۆی بووبوو)، کە دەیزانی بە تورکی بدوێت(بە شێوەیەکی سست و بەڕێزانە)، بەڵام نەیدەزانی پێی بخوێنێتەوەو بنووسێت. بۆیە قەشە پیتەریان بە یاوەری نارد لەبەر ئەوەی دەیزانی بە تورکی بنووسێت.

پاش ئەوەی گەیشتن پۆلیس نامەیەکی گرت بۆ کونسوڵخانەی نەمسا لە شاری ئەستەنبوول نێررابوو، بارو دۆخی کڵێسای لە ئەلبانیای تێدا ڕوون کرابووەوە سەبارەت بە چەوساندنەوەی پیاوانی ئایینی و بڕوادارانی کریستیان و ڕاوەدوونانیان. نامەهەڵگرەکە توانیبووی هەڵبێت. جا لەبەر ئەوەی لەو ماوەیەدا هیچ قەشەیەکی دیکە لەو ناوچانەوە نەگەیشتبووە ئەستەنبوول، بۆیە پۆلیسی تورك، بە پێی ئەو پرەنسیپەی بۆ خۆی دانابوو، قەشە پیتەری لە بەندیخانە توندکرد. ماوەی دوو مانگ لە بەندیخانە (لەژێر لێکۆڵینەوەدا) مایەوە، ئەگەرچی هیچ کەسێك وەك پێویست دەکات لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرد.

قەشە پیتەر باسی ئەو دوو مانگەی کرد کە لە بەندیخانەی ئەستەنبووڵ بەسەری برد، پترو جوانتر لەوەی سەبارەت بە هەموو شتێکی دیکەی جگە ئەو دوو شتە قسەی کرد، بە پچڕ پچڕی، لەسەر شێوەی پارِ پارِ، قسەی دەکردو دەدوا، وەك چۆن مرۆڤێك تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووبێت قسان دەکات و هەوڵ دەدات ئازارو ژانی جەستەو بیرکردنەوەی لە مردنێکی بەم زوانە لە گوێگر بشارێتەوە. ئەو پارِو بەشانە بە شێویەکی دروست و بەڕیزو یەك بەدوای یەکدا نەدەهاتن، بەڵکو لە کاتی درێژە پێدان بە قسەکانی زۆر جار هەندێکی دووبارە دەکردنەوە لەوەی کە دەیگوت و زۆر جاریش بازی دەداو دەچووە پێشەوەترو سەردەمێکی زۆری بەجێ دەهێشت. وەك مرۆڤ دەپەیڤی کات بەلای ئەوەوە هیچ واتایەکی نەمابێت، مرۆڤێك کات و درێژە پێدانی کات بە لای ئەوەوە هیچ بەهایەکی نەمابێت تەنانەت ئەگەر بەشێکی ژیانی ئەوانی دیکەیش بێت. ڕەنگە گێڕانەکەی بپچڕێت یان ڕووداوەکانی بەدوای یەکدا دێن یان دووبارە دەبنەوە. ڕەنگە باسی چەند شتێکی پێش وەختە بکات، پاشان پاشەوپاش دەگەڕێتەوەو، دوای تەواو بوون پاشماوەکە تەواو دەکات، ڕووداوەکان شی

دەکاتەوەو فرەوانتریان دەکات، گوێ بە شوێن و، بە کات و شتەکان و بە ڕووداوەکان نادات کە تا هەتایە ڕێڕەویان بە وردی دەستنیشان کراوە.

بێگومان لەم جۆرە گێڕانەوانەدا چەند بۆشایی و شوێن دەمێننەوە کە شی و ڕوون نەکراونەتەوە. لاوەکەیش لە قسەپێبڕینی قسەکەرەکە، یان گەڕاندنە دواوەی بۆ ئەو شوێن و بۆشاییانەو سەپاندنی پرسیارەکانی شەرم دایدەگرت. چونکە هەرچۆنێك بووە باشتر وایە ڕێ بە مرۆڤ بدرێت ئازادانەو بە ئارەزووی خۆی قسەبکات.

***

# یەکەمین پار

ئەوەی کە دانیشتووانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و کەشتییەوانانی سەر بە ڕەگەزو زێدی جیا جیا بە(دی بۆزیتۆ) ناوزەدی دەکەن شارۆچکەیەکی بچکۆلەی بەندکراوو پاسەوانانە، بە گۆڕەپانی نەفرەتی ناسراوە، وەك چۆن دانیشتووانی ئێرە ئەو ناوەیان لێناوە، بە تایبەتی ئەوانەی پێوەندییان پێوە هەبووە. لێرە لەم شارۆچکە گەورەیە کە دانیشتووانێکی زۆری لێیە، هەموو ئەوانەی ڕۆژانە بەند دەکرێن یان دەگیرێن، هەر هەموویان دەهێنرێنە ئێرەو بە ئێرەدا تێدەپەڕن. چ تاوانبار یان گومانی ئەوەی لێبکرێت کە تاوانبارە. لە ڕاستیدا لێرە تاوانباران زۆرن، هەموو جۆرێکیان تێدایە. بەڵام گومان تا دەهات لەسەر ئاستی ڕووپێوو بەرەو قووڵایی پەرەی دەستاند. ئەویش لەبەر ئەوەی پۆلیسی ئەستەنبووڵ بڕوای بە دروشمێك هەیە، دەڵێت: (ئازادکردنی کابرایەکی بێتاوان لە گۆڕەپانە نەفرەتییەکە لەگەڕان بەدوای تاوانبارێك لە کووچەو کۆڵانەکانی ئەستەنبوولدا ئاسانترە). بۆیە لێرە زۆر بە وردی و لەسەرخۆو ڕۆتینی بەندکراوەکان هەڵدەبژێررێن. هەیانە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت بۆ ئەوەی بدرێتە دادگە، هەشیانە ماوەی کورتی بەندکردنەکەی بەسەر دەبات، هەشیانە ـ ئەەر دەرکەوت کە بێتاوانە ـ ئازاد دەکرێت، هەشیانە ڕەوانەی شوێنێکی دوور دەکرێت و دوور دەخرێتەوە. ئەو ئەمبارە گەورەیەیە کە پۆلیس شایەتی ساختەو، ئاژاوەگێڕی لێ هەڵدەهێنجێنێت کاتێك پێویستی پێیان هەبێت، بەم چەشنە گۆڕەپانە نەفرەتییەکە حەشاماتی دانیشتووانەکەی خۆی لەبێژنگ دەدات. بۆیە بەردەوام دەیبینیت قەرەباڵغ و سیخنانەو، بەردەوام سیخناخ دەبێت و چۆڵ دەبێت.

ئەوانەی لە یاسا لایان داوە بە گەورەو بچووکیانەوە لێرەن: لە لاوێکەوە بگرە کە بۆڵە ترێیەك یان هەنجیرێکی لە سەبەتەیەکدا دزیوە، تا دەگاتە فێڵبازانی جیهانی و دزو جەردە ترسناکەکان، هەروەها بێتاوانان و ئەوانەیان درۆیان دراوەتە پاڵ و، شێت و بێ دەرەتانان،

یان ئەو پیاوانەی بە هەڵە لە ئەستەنبووڵ و هەموو لایەکی وڵاتەوە ڕاپێچ کراون و لەپێش دراون. زۆربەی ئەوانەی لێرەن گیراوی دانیشتووی خودی شاری ئەستەنبوڵن، بژاردەیەك خوێڕی تا دەگاتە خوێڕی ترن، ئەوانەی بەرهەڵای بەندەری ئەستەنبووڵ و دوکانەکانی ئەو شارەن، یان ئەوانەی دزە دەکەنە حەشارگەکانیەوە لەوپەڕی شارەوە. ئەوانە گەنجینەشکێن و، دزانی پاریزگارو، سەرکێشی پیشەگەرو، ساختەکاری گەورەو، دزو جەردەن، لەگەڵ ئەو نەدارانەی دزی دەکەن و خەڵك فریو دەدەن بۆ ئەوەی بژین، لەگەڵ سەرخۆشانی یارانی شەوو مەی ئەوانەی لەبیریان دەچێت پارەی ئەوە بدەن کە خواردوویانەتەوە، سەرخۆشانی بەگێچەڵ و بێکار و، ئەو بەستەزمانانەی ڕەنگیان زەرد بووەتەوە، ئەوانەی شتگەلێك لە کەرەستە بێهۆشکەرەکان دەخوازن کە ژیان پێی نەبەخشیون، بۆیە تلیاك بەکار دەهێنن، تلیاك دەکێشن یان دەجوون، هیچ شتێك نییە ڕێگەی بەدەستهێنانی ئەو ژارەیان لێ بگرێت کە ناتوانن دەستبەرداری ببن، ئەو پیرەمێردانەی ڕێگەچارەی چاکبوونەوەیان لەدەست چووە، ئەو لاوانەی چارەنووسێك بەرێی خراپدا بردوونی و ناتوانن خۆیانی لێ بپارێزن، ئەو پیاوانە چەندین ئارەزوو و هۆکارو نەریتی لەڕێ لادەریان هەیەو نایانشارنەوەو، دایانناپۆشن، بەڵکو بۆ خەڵکی ئاشکرایان دەکەن، لەبەر ئەوەی ئەگەر بشیانەوێت ناتوانن بیانشارنەوە، چونکە بەردەوام کارەکانیان پێش هەنگاوەکانیان دەکەوێت.

چەندین پیاوکوژ هەن تاوانگەلێکی زۆریان کردووە، هەشن توانیویانە پتر لە جارێك لە دیلی هەڵبێن، بۆیە لێرە دەیانبینیت بەر لە دادگەیی کردن و سزادانیان گەلەپچەکراون و بەزنجیر بەستراونەتەوە، زنجیرەکانیان پێکدا دەخشێنن و بە تووڕەیی نەفرەت لە ئاسن دەکەن و نەفرەت لەو کەسە دەکەن زنجیری داهێناوە.

هەموو ئەوانەی سزایان بەسەردا دراوە دەگەنە ئێرە بۆ ئەوەی سزاکانیان تەواو بکەن، لەوانەی ناوچەکانی ڕۆژئاواوە دەرکراون، بۆ ئەوەی لێرە چارەنووسیان دیاری بکرێت: یان بە هۆی واسیتەکاری ئەستەنبوڵی و ئەوانەی لە پشتیانن ئازاد دەکرێن و دەگەڕێنەوە ناو ماڵ و خێزانی خۆیان، یان بۆ ئاسیای بچووك یان ئەفریقیا دوور دەخرانەوە. ئەوانەی بە

(گەشتوەر) ناوزەد دەکرێن، بە گشتی لەو پیرانەن، کە کەسانێکن پلەو پایەیان لە شوێنی نیشتەجێی خۆیاندا هەیەو، نوێنەری هەندێك ئایین یان گرووپن کە لە شوێنێك لە شوێنەکانی وڵاتەکەیاندا بە گژی یەکدیدا چوونە یان ناکۆکی کەوتووەتە نێوانیانەوەو، دەستەڵات بەوەی تۆمەتبار کردوون یان نەیارەکانیان گوتوویانە ئەوانە نەیاری سیاسی یان شۆڕشوانن، ئێستە دەیانبینن سنووق و هەگبەی پڕ لە جل و بەرگ و شتومەکیان ئامادەکردووەو بەرانبەر بە تەرەسەکانی ئەستەنبوڵ بەرگرییان لێدەکەن، کە ناچارن لە ژوورەکەدا جێیان بکەنەوە، پاشان دەکشێنەوە تا بتوانن بە خەفەت و پەژارەوە لە گۆشەیەکدا دەگیرسێنەوە.

پازدە تەلاری زەمینی و یەك نهۆم، بە درێژایی چەندین ساڵی دوورو درێژ دروست کراون و فرەوان کراونەتەوە، شوورەیەکی بەرز پێکەوەیان دەبەستێتەوە گۆڕەپانە درێژو لێژەکە دادەخات کە شێوەیەکی ڕێك و پێکی نییە. بەردی ڕەشی ڕیزکراویش نابینیت تەنیا لەبەردەم بینای تایبەت بە پاسەوانان و نووسینگەکانی کارگێڕی نەبێت، هەرچی شوێنەکەی دیکەیە زەوییەکی-خۆڵینی ڕەق و تەقی بۆرە تەنانەت گیای لێ شین نابێت. بەم شێوەیە تێدەگەیت چەند کەس ڕۆژانە لە بەیانییەوە تا ئێوارە بەسەریدا دێن و دەڕۆن. هەرچی ئەو دوو یان سێ درەختە بەرزەن، ئەوە وشك هەڵاتوون و لەناو گۆڕەپانەکەدا پەرت بوونەتەوەو، توێکڵیان لێ بووەتەوەو ڕووشاونەتەوە، لەدەرەوەی چوارچێوەی وەرزەکان ژیانی کولەمەرگانە بەسەر دەبەن. ئەم گۆڕەپانە گەورەیەی دەستدرێژیکارە بەرۆژ لە بازاڕێکی میللی پیشانگەی هەموو ڕەگەزو گەلان دەچێت. شەوانە ژوورەکانی بە هەموو ئەم کۆمەڵە مرۆڤانە سیخناخ دەبن، هەر ژوورەو پازدە یان بیست یان سی پیاوی تێ دەئاخنرێت، بەشێوەیەك ژیانێکی پڕ هەراو هوریاو جۆراجۆری تێدا بەردەوام دەبێت کە هیچ شەوێکی هێور بە خۆوە نابینێت.

تاوانبارە بەهێزەکانی ئەستەنبوڵ ئەوانەی نە لە پاسەوانەکان دەترسن و نە ڕێزی کەس دەگرن، گۆرانی بێ ئابڕووانە دەچڕن و، هاوار دەکەن و وشەو بانگەوازی ناشیرین بە گوێی هاوەڵەکانیان لە گیراوەکانی ژوورەکانی تەنیشتیاندا دەدەن. کەسانێکی نادیار لەسەر شوێن

و جـێ تێکـدەگیرێن. ئەوانـەی شـتیان دزراوە هـاوار دەکـەن و داوای فریاکـەوتن دەکـەن. هەندێکیان لەکاتی نووستندا کە هەناسـە دەدەن ددانەچیرە دەکـەن، هەنـدێکیان گـەروویان دەگیرێت و وەك سـەربڕراو پرخـەیان دێـت، ئـەو کـات ژوورە گەورەکـە تـەنیا بـەدەنگ وەك دارستانێك لە تاریکیدا بەسەر دەبات، ساتێك گوێت لە پێکـەنینێکی نائاسـایی دەبێـت و ساتێکی دیکەیش گوێت لە هەناسەدانێکی دەبێت وەك بلێییت شـیعرە، یـان دوو وشـە یـان سێ وشە، لـە وشـەگەلی درێـژکراوەی گۆرانییـەك دەگوترێـت، کـە ئەلتـەرناتیڤی غـەمبارو ئامەزرۆیانەی ئارەزوو و هەستی جۆراوجۆرە، هەندێگ جاریش گوێـت لـە چـەند دەنگێکـی قورسی ئەوتۆ دەبێت لە قوڕگەوە دەردەچن و کەس تێیان ناگات.

لەدەرەوە چەند زرمەیـەك وەك زرمـەی دەرگـە لێـدان دزە دەکەنـە ژوورەوە، ئـەویش کاتێك دەرگە کۆنە دوو لایەکە ـ کە لە کاتی کردنەوەو داخستندا جیڕەی دێـت ـ ئـەوانە تـاك تـاك یـان بـە کۆمـەڵ پێـشوازی لـە خـەڵکی دەکـرد یـان بـەرێی دەکـردن. ئـەوانە سزادراوەکان دەبران بۆ ئەوەی سزاکانیان بەسەردا جێبەجێ بکرێت یـان بـۆ شـوێنی دوورو دوور بخرێنەوە. زۆر جار پیاوانێك ڕاپێچ دەکران تێکگیرانێکی گـەورەیان لـە بەندەرەکـەدا ناوەتەوە، کەف دەچەرێنن و قژیان بژ بووەتەوەو شوێنی بۆکسیان بـە ڕوخـسارەوە دیـارەو دەم و چـاویان خوێنـاوی بـووە، کـە هێـشتە لـە ئاکـامی تـووڕەیی و خواردنـەوەو ئـەو مستەکۆڵانەی بەریان کەوتووەو ئـەو مـستەکۆڵانەی ئاراسـتەیان کـردووە گـەرم و گـوڕن. دەبینیـت ئـەمیان بەسـەری ئـەوی دیکـەدا دەشـیڕێنێت و، هەڕەشـە لـە یەکـدی دەکـەن، چـاوەڕێن هـەر هـەلێکیان بـۆ ڕێـك بکـەوێت جـارێکی دیکـە مـستەکۆڵەیەك ئاراسـتەی نەیارەکەیان بکەن کە پاسەوانە خێراکان ڕەپێشیان داوە. کاتێك لێکیان دوور دەخەنـەوەو بەندیان دەکەن، بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ نایەنـە سـەرخۆ. لـەم ژوورو ئـەو ژوورەوە هـاوار دەکەن و هەڕەشە لە یەکدی دەکەن و جنێو بەیەك دەدەن.

کاتێك بەیانیان ڕۆژ دەبێتەوە، شتەکان لای مرۆڤـی دروست و پـاك کـەمێك هێـور دەبنەوە، تەنیا کەمێك، ئەو کات هـەموو ئـەو خەڵکـە لـە ژوورە جـۆراو جۆرەکانیانـەوە دەرژێنـە گۆڕەپانـە فرەوانەکـەوە. لێـرەدا، لەبـەر تیـشکی هـەتاودا، خـۆ دەدۆزن و

ئەسپێکانیان لەناو دەبەن، برینەکانیان تیمار دەکەن، یان لەسەر گێڕانەوەی نوکتە بێ بەهاو ناکۆکییە توندەکانیان بەردەوام دەبن کە کۆتاییان نایەت، یان کۆتایی بە پرسە تاریکەکانی خۆیان دێنن.

لەوێ ئەڵقەی مرۆیی پڕ هەراو هوریا یان هێور دروست دەبێت. هەر ئەڵقەو ناوەڕاستێکی هەیە. لێرە کۆمەڵێك سەرکێش یان نوکتەباز، لەوێ پیاوێکی تەنێ لەسەر خۆی گۆرانی دەچرێت یان شیعرو گۆرانی پێکەنیناوی دەچرێت و دەڵێتەوە. لەوێش فرەبێژێکی شێت یان لەڕێلادەرێکی ڕاماو دەبینرێت تاکەکانی ئەڵقەکە پێی پێدەکەنن، پێکەنینێکی هەرزان و ڕووسەختانە. قەشە پیتەر لە ئەڵقەیەکیان نزیك دەبێتەوە، لە دوورەوە گوێ دەگرێت و تەماشا دەکات. (خۆشبەختانە جل و بەرگی سڤیلم لەبەرەو کەس نازانێت من کێم و من چیم!).

لێرە لە تەنیشتی ئەم بینایەوە کە لێی نیشتەجێیە هەموو بەیانیانێك ئەڵقەیەك لەو پیاوانە دروست دەبێت لە سێبەردا لەچوار دەوری کابرایەك ڕادەوەستن ناوی (سەرکردە)یە، دیمەنێکی تۆقێنەری هەیەو، لەسەرخۆ دەپەیڤێت بەڵام بە بڕوابەخۆبوون و سرووشەوە. ئەوەی دەیڵێت بەردەوام پێوەندی بە خۆیەوە هەیە، هەر هەمووی بە بازدانی گەورە گەورە دەگێڕێتەوە. بەردەوام باسی هەمان ئەو شتانە دەکات کە مەزن و گەورەیان دەکاتەوەو دەخاتە سەریان بە شێوەیەك پێویست دەکات بەلایەنی کەمەوە مرۆڤ سەد و پەنجاساڵ بژێت تا بتوانێت هەر هەموو ئەو شتانە بگوزەرێنێت.

هێشتە هەتاو بەرزنەبووبووەوە قسان دەستیان پێکرد:

ـ بەخوا زەعیم ئاغا توانیوتە هەموو جیهان ببینیت.

ـ بەڵێ. بەڵام هەموو ئەوە چ سوودێکیان هەیە لەکاتێکدا وەك دەبینیت گیرۆدەی ئێرە بوومە! مادامەکێش خەڵکی ئەوەندە بێ بەهان ڕێ بەمرۆڤی سەربڵند نادەن بۆ خۆی بژیت؟ بەڵی ڕاستە زۆر شوێن گەڕاوم، بەردەوام پێم خۆش بووە خەڵکی ڕێزم لێ بگرن و بانگێشتی لای خۆیانم بکەن، بەڵام وەك پێویستیش دەکات لەگەڵ هەموو مرۆڤێکدا بەڕێز بوومە.

پاشان بەبێ دەنگ تەماشای بەردەمی خۆی دەکات، وەك بڵێیت شتێك لە یادداشتنامەدا بخوێنێتەوە، کە دەست پێدەکاتەوە، وەك بڵێیت لەو شوێنەوە بەردەوام دەبێت کە لێی ڕاوەستا:

- لە ئادابازاڕ بوومە بە سەرکردەو ژنم هێنا. ئافرەتێکی تێگەیشتووی باشم خواست. خەڵکی زۆریان ڕێز لێدەگرتم، دوکانەکەم لەو شارۆچکەیە بۆ کاروباری بەرایی بۆیەکردن بوو.

- بۆچی لەوێ نەمایتەوە؟

- ئاخ.. بۆچی؟ ئیبلیس قایلی کردم ژنێکی دیکەیشم هێنا. ئیدی لەو ڕۆژەوە هەموو شتێك دەستەبەجێ هەڵەوگێڕ بووەوە. ڕاستە ڕۆژانی سەرەتا بەختەوەری کردم، دەبێت ددان بەوەدا بنێم، بەڵام ڕەوشتێکی سەیری هەبوو! گرنگ ئەوە نییە وای لێکردم لەگەڵ یەکەمین ژندا تێك بگیرێم و ماڵەکەی لێ کردمە دۆزەخ، بەڵکو لەماڵ دەردەچوو، دەچووە شارۆچکەکەو، وەك دەڵێن: بەدەستێکی پووشی پێبوو، بەو دەستەکەیشی ئاگر، بۆ هەر کوێیەك بڕۆیشتایە شەڕو دەمەقاڵێ دەستی پێدەکردو ڕك و کینەی دەنایەوە. تەنانەت، وەك دەڵێن، وای دەکرد هەردوو چاو کە بەقەد سەرێکەوەن لەگەڵ یەك بەشەڕ بێن. برایان بەم شێوەیە وای لێهات یەکەمین ژنم دەری دەکردم و، خەڵکی ڕکیان لێ دەبوومەوە. کاتێك بۆم دەرکەوت کە خەریکە ناوبانگی و کڕیارانی خۆم لە دەست دەدەم و، ئەگەر بارودۆخ بەم شێوەیە بڕوات ئەوە سەری خۆیشمی تێدا دەچێت، بۆیە بە نهێنی کاڵاو ئامێرەکانم هەرزان فرۆش کردو، جارێکی دیکە دەستم بە گەڕان بە جیهاندا کرد.

یەکێکیان بە پەژارەوە گوتی:

- ئاخ، بەداخەوە چ ژیانێکی ناخۆشە.

سەرکردە بە غەمباری سەری دەلەقێنێتەوە، وەك بڵێیت تەنیا کەس بێت مەودای ئەو ژیانە بزانێت.

- ئێ، ئەی بۆچی ئەی ڕاکردوو وێڕای ئەو هەموو دەوڵەمەندی و ناودارییەت ئەوت قاو نەداو خۆت هەڵاتیت!

پیاوێکی بازوو ئەستووری ناو ئەڵقەکە ئەمەی بە دەنگێکی گڕ گوت.

ـ دەری بکەم، دەری بکەم! ئەوە ئاسان نییە. ئەگەر دەزانیت چ جۆرە ئافرەتێک بوو ئەوە نەتدەتوانی بیر لە جیابوونەوە لەخۆپێوەنووساندنی بکەیتەوە لەکاتێکدا دەبینیت بەبێ ئەو ناتوانیت.

ـ ئاخ، چی؟ دەرم دەکرد ئەگەرچی هەتاو لە نێوان هەردوو ڕانیدایەو، مانگ بەسەر سکیەوەیە.

پیاوە بازوو ئەستوورەکە ئەمەی گوت و بە تووڕەیی لە ئەڵقەکە جیا بووەوە، بە دەستی ڕووی خۆی ڤەشێرت.

ـ ئاخ، ئافرەت.. ئافرەت.. ئافرەت چییە؟ کاتێک مۆمەکە دەکوژێنیتەوە هەر هەموویان وەك یەکن.

پیاوە بچووکەکە لەسەر گێڕانەوەکەی خۆی بەردەوام دەبێت و چۆن چووەتە (ترابیزنت) و لەوێ بێوەژنێکی زەنگینی خواستووە.

ـ وەك چاو چۆن بەقەد سەرەوەیە بەو شێوەیە نازی هەڵدەگرتم. چوار ساڵم لەگەڵی بەبەختەوەری و شادی گوزەراند! بەڵام لەبەدبەختیم ئەوەبوو نەخۆش کەوت و مرد، لەبەر ئەوەی بە مردنی ئەو زۆرِ خەفەتبار بووم نەمتوانی لەوێ بمێنمەوە. هەموو شتێکم فرۆشت و، جارێکی دیکە دەستم بە گەڕان بەم جیهاندەدا کرد. لە زۆر شوێن کارم کرد، لەهەر هەموو شوێنەکان لەبەر ئەو دوو دەستە زێڕینەم ڕێزیان دەگرتم. گەیشتمە سالۆنیك، لەوێش ژنم هێنا.

ـ جارێکی دیکە!؟

ـ چوار پیشە دەزانم، یازدە جار ژنم هێناوە.

ـ ئاخ، ئاخ! ئەی چیت کرد؟

یەکێك لە ئەندامانی ئەڵقەکە ئەو پرسیارەی کرد.

ـ چیم کرد؟ خزمە گەوادەکانی فریویان دام. ئەگەر ئەمڕۆ بتوانم نیوەی ئەو قەردانەیان لێ وەربگرمەوە کە قەرداری منن ئەوە دەبوومە پیاوێکی زەنگین و، بە ئاسانی دەمتوانی لەم ئەگبەتییە قوتار بم و، لێرە بچمە دەرەوە.

نەگبەتییەکەیشی ئەوەبوو بە مامەڵەکردن بە دراوی ساختە تاوانبار کرابوو. لەوەیش خراپتر ئەوە یەکەمین جار نەبوو ئەو تۆمەتەی بدرێتە پاڵ. شتەکە بەلای ئەوەوە وەك جۆرە نەخۆشییەکی لێهاتووە، چونکە هەرکە ئەم جۆرە تۆمەتەی لەکۆڵ دەبێتەوە، یان سزای لە بەندیخانە بەسەر دەبات، خێرا دەست بە کارێکی لەو جۆرە دەکات، یان تاوانێکی ئەنجام دەدات. جا لەبەر ئەوەی وەستایانە نەیدەکرد یەکسەر دەیانگرت. لەو ماوەیەشدا هەر خەونی دەبینی و سەبارەت بە ژنهێنانی بەختەوەرانەو هەر چوار پیشەکەی درۆی دەکرد. ئێستەیش لە سزایەکی توندو دژوار دەترسێت، ئەگەر تاوانەکەی بەسەردا بسەپێت، ئەوە ئەندێشە دەیباتەوەو خۆی بە درۆ هەڵدەخەڵەتێنێت، درۆگەلێك نیوەیان ڕاستن و نیوەیان درۆن، بەدرێژایی ڕۆژگار دەیانگێڕێتەوە، هەموو ڕۆژێك لەبەردەم ئەو پیاوانەدا دەیانگێڕێتەوە کە دەوریان داوەو ئامادەن پێی پێبکەنن و گاڵتەی پێ بکەن. هەرکە ئەلقەکە بڵاوەی لێ دەکات وەك گیانێکی ئازاردراو لە گۆڕەپانەکەدا دەخولێتەوەو، لە ئەلقەیەکی دیکە نزیك دەبێتەوە. بە دەربڕینی پەژارەو خەم و گریانەوە کە بە دەم و چاوییەوە دیارە گوێ لە نوکتە دەگرێت ئەوانی دیکە بەوپەڕی ئارەزووەوە پێدەکەنن کاتێك گوێیان لێ دەبێت. گوێ لە هەموو ئەو شتانە دەگرێت کە دەگێڕرێنەوە بەوپەڕی قایلی و ئوقرەوە چاوەڕێی نۆرەی خۆی دەکات. کاتێك هەلێکی گونجاو دەقۆزێتەوە ڕاستەوخۆ خۆی تێهەڵدەقورتێنێت. ئەگەر یەکێکیان ناوی دەوڵەتێك ببات، بۆ نموونە میسر، ئەوە سەرکردە بە سەربوردەیەکی ئامادە قسەکەی پێ دەبڕێت:

- ژنێکی میسریم هەبوو. ڕێزی دەگرتم و بەوپەڕی بەتەنگەوەبوون چاودێری دەکردم، ئەگەر دایکم بووایە بەو شێوەیە نەیدەپاراستم. دوو ساڵمان پێکەوە بەسەر برد. لای خەڵکی بەڕێزبووم، بەڵام چی بکەم. ڕۆژێکیان...

جارێکی دیکە سەربوردەیەکی دیکە سەبارەت دەوڵەتێکی وەهمی و سەبارەت بە ژنهێنانێکی سەرنەکەوتووانە دەستی پێدەکرد، هەندێکیان گوێیان لێ دەگرت لەگەڵ گوێ نەگرتنی بێ بەهایانەو گاڵتە پێکردندا، لە کاتێکدا کەسانێکی دیکە دەکشانەوە هەرکە دەستی پێدەکردو بە دەستیان ئاماژەیان دەکرد بێ ئەوەی خاتری سەرکردە بگرن:

- ئەمە هەژدەمین ژنیەتی.
- خواتان لەگەڵ ! ئاگەدارمان بکەنەوە کاتێك سەربوردەکەی تەواو دەکات.

بەڵام سەربوردەی پیاوە شێت و ساختەکارەکە کە هیچ چارێکی نییە، سەرکردە، ئەوەی خەون بە ژیانێکی هێورەوە دەبینێت لەگەڵ ژنێکی نموونەییدا، لەناو هات و هاواری گرووپێك پیاودا بزر دەبێت کە لە تەنیشتیەوەن و دەمەقاڵێیەکیان لەنێواندا سەری هەڵداوەو دەنگی جنێوەکانیان بەرزبووەتەوە بە شێوەیەك لەناو خەڵکانێك لە دەرەوەی گۆڕەپانەکە دەژین جنێوی لەو جۆرە بەرگوێ ناکەوێت.



تەنانەت شوێنی گۆڕەپانە نەفرەتییەکە شوێنێکی سەیرە، وەك شوێنێك بۆ ئازاردانی گیراوەکان و لەناوبردنیان. (زۆر جار قەشە پیتەر دەگەڕایەوە سەر ئەو باسەو دەیویست بە وردی وەسفی بکات). لە گۆڕەپانەکەوە هیچ شتێکی شارەکە یان بەندەرەکە یان ئەو جبەخانە چۆڵەی سەر کەنارەکە لە خوارەوە نەدەبینرا. تەنیا شتێك کە دەبینرا ئەو ئاسمانە گەورەو لەڕادەبەدەر جوانە نەبێت. لە دوورەوەیش ناوچەیەکی باریکەلەی کەناری سەوزی ئاسیا، لەو بەری ئەم دەریا بەرینەوە، هەندێك منارەی مزگەوتی نەناسراو، یان پەیکەری زل زل لەو دیوارەوە قوت بوونەتەوە. هەموویان بێ مۆرك و، سەیرو بێ ناو. تا مرۆڤی نامۆ هەستێکی بەردەوامی لا دروست بێت کە لەناو خاکی دوورگەیەکی ئیبلیسیانەدایە، دوور لەو ژیانەی کە بەلای ئەوەوە ژیان بوو، ئومێدی ئەوەشی نییە جارێکی دیکە بیبینێتەوە. هەرچی ئەو گیراوانەیە کە خەڵکی خودی شاری (ئەستەنبوڵ)ن، ئەوانە لەگەڵ هەموو دەردەسەری و نەگبەتییەکانیاندا، ئەوانە ئەو سزایە دراون کە هیچ شتێك لە شارەکەیان نابیسن و نابینن، ئەوان لە شارەکەدان، بەڵام سەدان میل لێوەی دوورن. ئەم دوورییە مەزەندە کراوەیش وەك ئازاری دووری ڕاستەقینە ئازاریان پێدەگەیەنێت. بۆیە ئەوەندە نابات گۆڕەپانە نەفرەتییەکە گوشار دەخاتە سەر مرۆڤ و دەیکاتە کۆیلەی خۆی و، بەم شێوەیە بزر دەبێت. هەموو شتێکی پێشتر لە یاد دەچێتەوەو، بەشێوەیەکی

کەمترو کەمتر لەوەی کە دێت بیر دەکاتەوە، تا ڕابوردوو و ئایینده لە یەك ئێستەی ژیانێکی ناهەمواری نا مرۆییانەی نێو گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا هەرەس دەهێنێت.

ئەگەر بێت و هەور ڕووی ئاسمان داپۆشێت و، بای گەرم و ناتەندروستی باشوور هەڵبکات و،بۆنی بۆگەنی دەریاو پاشەڕۆکی شارو بۆنە ناخۆشەکانی بەندەرە نەبینراوەکەی لەگەڵ خۆدا هێنا، ئەو کات ژیان لەناو ژوورەکان و لە گۆڕەپانەکەیشدا دەبێتە دۆزەخ. ئەو بۆنە ناخۆشانە تەنیا لە بەندەرەکەوە نایەن، بەڵکو بە هەموو تەلارو شتەکاندا پەرت و بڵاو دەبنەوە، تا ڕادەیەك وا پێدەچێت هەموو ئەو شتانەی گۆڕەپانە نەفرەتییەکە گوشاری خستوونەتە سەر هێدی هێدی شیتەڵ دەبنەوەو، ژەهر بڵاو دەکەنەوە کە مرۆڤ لەناو دەبەن، تا بێزار دەبێت و، حەزی لە ژیان نامێنێت. چونکە با هەڵدەکات و وەك نەخۆشییەکی گشتی نەبینراو تووشی هەر هەمووان دەبێت، تا تەنانەت دەچێتە کەوڵی پیاوە تۆکمەو هێورەکانەوە. بۆیە بەچەند جووڵەیەکی خۆنەویستانە دەست بە ئاژاوە نانەوە دەکەن کە پاڵنەرێکی نەبینراو پاڵیان پێوە دەنێت و بە دوای کێشەو گرفتدا دەگەڕێن. بەهەستێك کە لەناخی گیراوەکانداییەو هەستی پێدەکەن تەنانەت بۆخۆشیان بوونەتە بارگرانی، دەست بەگێچەڵ کردن بە هاوەڵەکانیان یان پاسەوانەکان دەکەن کە ئەوانیش بە خۆیان لە هەموو شتێکی ئەو ڕۆژگارە هەڵچوونەو تووڕەبوونە. بۆیە دەمارەکان تا ئەوپەڕی ئازارو ئێشان هەڵدەچن، یان بە خێرایی لە ئاکامی تەقینەوەی مەترسیدارو ڕەفتارو هەڵس و کەوتی ناژیرانەوە شل دەبنەوە. بۆیە دەمەقاڵێی توندی ئەوتۆی بێ هیچ هۆیەك ڕوو دەدات و، کێشەی دەستکرد تەنانەت لە خودی گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا ڕوو دەدات. لەکاتێکدا هەندێکیان تووڕە دەبن و لەگەڵ هەر کێیەکدا بێت بەشەڕ دێن، کەچی هەندێکی دیکەیان، لە بەتەمەن و گۆشەگیرەکان، بۆ چەندین سەعات بە چیچکانێ و دوور لەوانی دیکە دادەنیشن، کە شت شی دەکەنەوەو لەگەڵ نەیارە نەبینراوەکانیاندا، بە چرپەی نەبیستراو، یان دەربڕینی ڕەشبینانەو جووڵەی بێ هێز بە دەست یان بەسەر مشت و مڕ دەکەن، وەك بڵێیت تارمایی بن.

لەو ساتانەدا شێتییەکی گرژی گشتی تەشەنە دەستێنێت، وەك پەتاو بڵێسەیەکی خێرا لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی دیکە بڵاو دەبێتەوە. لە خەڵکییەوە بەرەو گیانلەبەران و

شتە بێ گیانەکان تەشەنە دەکات، ئیدی ڕسقی گەورە گەورە وەك تیری خێرا لە نێوان ئەم دیوارو ئەو دیواردا دەست بە جرت و فرت دەکەن، خەڵکەکەیش توند بە دەرگەکاندا دەدەن و، بە کەوچکەکانیان تەق و تۆق بە کاسەو دەفرەکانیاندا دەدا تا ماندوو دەبوون و بێ ویستی خۆیان کەوچك و ئامێرەکانیان لەدەست بەر دەبوونەوە. بۆیە لە چەند ساتێکی کورتدا هەموو شتێك لە هەرەسهێنانێکی گشتی نەخۆشانەدا کۆتایی دەهات.
دوای ئەوە دەست بەجێ لە هەندێك ژووری داخراودا، لەگەڵ یەکەمین شەپۆلی تاریکی شەودا، هاوارێکی گشتی دەست پێدەکات تا ڕادەیەك هەموو گۆڕەپانەکە دێتە لەرزین و دەنگەکە پەرچ دەداتەوە. زۆر جار ژوورەکانی دیکەیش بەشداری لە هاوارکردنەکەدا دەکەن، تا ڕادەیەك هەر کەسە دەنگی هەبێت بەهەموو هێزو توانای خۆی لە گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا دەقیژێنێت، بە ئومێدێکی نەخۆشانەوە کە هەموو شتێك بەسەر ئەم هەراو هوریایەدا بتەقێتەوەو تێك و پێك بشکێت و، بە هەر شێوەیەك بووبێت بە یەك جاری و تا هەتایە کۆتایی پێ بێت.
لەو ساتانەدا گۆڕەپانە نەفرەتییەکە دەلەرزێت و وەك خشخشەیەکی زەبەلاحی منداڵ بە دەستێکی زەبەلاحەوە دەلەرزێتەوە، ئەوانەی لە ناویدان سەما دەکەن و، هاوار دەکەن و، بە یەکدیدا دەدەن و، وەك شتی وردۆك لەناو ئەو خشخشۆکەدا پێکدا دەدەن.
بەڕێوەبەرو پیاوەکانی، باش کاریگەری ئەم بایە بۆگەنە ترسناکەی باشوور دەزانن، بۆیە [illegible] بۆیان بکرێت خۆیان لە بەگژداچوونی گیراوەکان دوور دەگرن، ئەوان بە خۆیان تووشی ئەو [illegible]بایەن، هەڵچوونەو پاسەوانی دەروازەکە دەکەن و، پاسەوانی توندتر دەکەن و، بەوپەڕی سنگ فرەوانییەوە چاوەڕوانن ئەو بایەی باشوور ڕاوەستێت. بە ئەزموون و تاقیکردنەوە، باش دەزانن کە هەر هەنگاوێك (بۆ یاسا سەپاندن) ترسناك و نەکەردەنییە، چونکە بە ڕاستی کەسیان نییە ئەو کارە بکات و، کەسیش نییە بە گوێیان بکات و مل کەچ بکات.
کاتێك بای تەندروستیانی باکوور بەسەر بای باشووردا زاڵ دەبێت ئاسمان کەمێك ساماڵ دەبێت، هەتاو هەڵدێت و هەوا پاکژ دەکاتەوە، گلۆڵەی گیراوەکان بە گۆڕەپانەکەدا پەرت دەبێتەوە. پیاسە دەکەن و چوون نەخۆش چاك بووبنەوە، یان چوون خنکاو ڕزگار

کرابن گاڵتە دەکەن و پێدەکەنن. هەموو ئەو شتانەیش لە دوو یان سێ ڕۆژی ڕابوردوودا ڕوویان دابێت لەسەرخۆ خۆ بەدەستی بیرچوونەوە دەدەن، تەنانەت کەس ناتوانێت ئەگەر بشیەوێت هیچی دیکەی بیر بکەوێتەوە.

لەتیف ئاغا، کە نازناوی (قەرەقۆز)ە بەڕێوەبەری ئەم دەزگە سەیرو ناڵەبارەیە، لەمێژە ئەم نازناوە بووەتە ناوی ڕاستەقینەو تاکە ناوی بەڕێوەبەر. تەنانەت نەك هەر لێرە بەم ناوەوە ناسراوە بەڵکو لەدەرەوەی شوورەکانی ئەم گۆڕەپانە نەفرەتییە. بۆیە بە ڕاستی بە شێوەو بە نەریت و هەڵس و کەوتەکانی جێی ڕیسوایی ئەم گۆڕەپانە نەفرەتییە بوو.

باوکی مامۆستای خوێندنگەی سەربازی بوو، پیاوێکی هێورو لەسەرخۆ بوو، حەزی لە کتێب و بیرکردنەوە دەکرد، درەنگ ژنی هێنابوو، تەنیا ئەم کوڕەی هەیە. کوڕەکە بە منداڵی چالاك و زیرەك بوو، کتێبی خۆش دەویست، بە تایبەتی میوزیك و هەموو جۆرە سەمایەك. تا تەمەنی چواردە ساڵی باشی خوێندبوو. وا دەهاتە پێش چاو کە ڕێبازی باوکی دەگرێتە بەر. بەڵام ئەو کاتە چوست و چالاکی بوو بە شەڕەنگێزی، زیرەکییەکەیشی پێچەوانە بووەوە. لاوەکە بە شێوەیەکی خێرا گۆڕا، تەنانەت بە شێوەو ڕوخساریش. بە شێوەیەکی خێرا گەورە دەبوو، بە شێوەیەکی ناسروشتی قەڵەو بوو. هەردوو چاوە هەنگوینییە زیرەکەکەی یارییان دەکردو دەلەرزینەوە وەك بڵێیت بەسەر مەنجەڵێك ڕوونەوەن. وازی لە خوێندنگە هێنا، دەستی بە یاوەری میوزیك ژەنانی قاوەخانەکان و یاریزانانی سووك پیشەو سیحربازو قومارچی و سەرخۆش و تلیاك کێشەکان کرد. بەخۆی ئەو بەهرەو بلیمەتییەی نەبوو، ئارەزووی قومارو سەرخۆشیش نەبوو. بەڵام ئەم جیهانەو هەموو ئەوەی لە بارەیەوە دەهۆنرێتەوەو باس دەکرێت سەرنجی ڕاکێشا، تەواو وەك چۆن هەموو شتەکانی سەر بە جیهانی هێوری دەستبەرداری بوون، ئەوانەی چارەنووسێکی ئاسایی و نەریتی ڕەسەنیان هەیەو، پابەندی ڕێك و پێکین.

لەبەر ئەوەی لاوەکە هەڵچووبوو، ئەزموونێکی ئەوتۆیشی نەبوو بۆیە خێرا کەوتە داوی کاری گومان لێکراوو سەرکێشی ناشیرین کە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ئەنجامی دابوون و ڕوو بە ڕووی یاسایش بووەوە، نەك تەنیا یەك جار بەڵکو چەندین جار باوکی لەبەندیخانەی قوتار

کرد، ئەویش بەسوود وەرگرتن لە پلەی خۆی و خزم و ناسراوەکانی لەوانەی پلەو پایەیان هەیە، بەتایبەتی بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس، کە کۆنە برادەرو هاوەڵی خوێندنی بوو. باوکە غەمبارەکەی پرسی: (ڕێی تێدەچێت کوڕەکەم هەڵبکوتێتە سەر ماڵێک و، دزی لە بازرگانان بکات و، دەستدرێژی بکاتە سەر کیژان؟). بەڕێوەبەرە بەساڵداچووە بە ئەزموونەکە بە هێوری گوتی: (بەڵێ، دزی دەکات، نەك تەواو بە خۆی دزی لە بازرگانان دەکات یان فریویان دەدات یان دەستدرێژی دەکاتە سەر کیژان، بەڵام ئەو کارانە لەهەر کوێیەك ڕوو بدەن لەوە دڵنیا بە کە دەستی ئەویان تێداە، ئەگەر بەو شێوەیە وازی لێ بێنین ئەوە بەخۆی نغرۆی هەڵە دەبێت. بۆیە پێویستە لەکاتی گونجاودا چارەسەرەری بۆ بدۆزینەوە).

ئەوەبوو بەڕێوەبەری پۆلیس (چارەسەری) دۆزییەوە، لای وابوو تەنیا چارەسەرە کە ڕێی تێ بچێت، بەڵکو باشتر وایە: ئەو لاوە کە ڕێی خراپەی گرتووە بەسوودی خۆی بەکاربهێنێت. وەك چۆن زۆر جار ڕوودەدات، ئەو پیاوە لاوە پایەدارەی ناو سەرکێش و بێکارەکان، بوو بە پۆلیسێکی ئەستەنبوولیی باش و پەرۆش.

کوتوپڕ وای لێ نەهات، لە ساڵانی سەرەتادا وازی لەو کارە هێناو بەدوای پلەو پایەی خۆیدا دەگەڕا، لەوێ دۆزییەوە کە پێشبینی نەدەکرد: ئەویش لە کارکردن دژ بە هاوەڵە کۆنەکانی، بۆیە بێ بەزەییانە کەوتە وێزەی دەربەدەرو سەرخۆش و دزو جەردەو قاچاخچی و بێ دەرەتانان لەهەموو ڕەگەزێك لەگەڵ بێکاران لە کووچەو کۆڵانە تاریکەکانی ئەستەنبووڵدا. بەوپەڕی ئارەزووەوە کاری دەکرد، بە ڕك و کینەیەکی زۆرەوە کە باس نەکرێت، بەڵام بە لێهاتوویی و ناسینی ئەو ناوەندانەی کە هیچ کەسی دیکە وەك ئەو شارەزایان نەبوو. پێوەندییەکانی پێشووی یارمەتییان دا بازنەی کارەکەی فرەوانتر بکاتەوە، چونکە شتێکی ئاساییە تاوانکارە بچووکەکان مل بۆ تاوانکارە گەورەکان کەچ بکەن. بۆیە زانیاری لەبارەی خەڵکەوە کەڵەکەی کردو، تۆڕی زانیاری بەهێزو فرەوانتر بوودوە. بۆیە پەرۆشی لەڕادەبەدەرو، سەرکەوتن لە کارەکەیدا پاش دە ساڵ وایان لێ کرد لەم (سەربازگە)یە ببێتە یاریدەدەری بەڕێوەبەر. کاتێك بەڕێوەبەری بەساڵداچوو بە دڵەکوتەیەك مرد، ئەو تەنیا کەس بوو شایەنی ئەوە بێت جێی بگرێتەوە. ئیدی لەو

کاتەوە دەستڕۆیشتوویی ڕەهای بەسەر گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا دەستی پێکرد، ئەوەتە بۆ بیست ساڵیش دەچێت بەردەوامە.

هەرچی بەڕێوەبەری پێشووە، کە پیرەمێردێکی توندو بە ئەزموونە، ئەوە شێوازێکی کلاسیکیانەی ڕەقی لە کارگێڕیدا پێڕەو دەکرد. شتی سەرەکی و گرنگ بە لای ئەوەوە شوورە بۆ کردنی ئەم جیهانە نەفرەتییە نایاسابییەیە بە هەر هەمووی و بە شێوەیەکی وردو بە تەواوەتی جیاکردنەوەی لە جیهانی یاساو سستەم. لادانی تاکەکەسی زۆر بەلاوە گرنگ نەبوو. لە ماوەی چەند ساڵی دوورو درێژدا بەو شێوەیە تەماشای گۆڕەپانە نەفرەتییەکەو ئەوانەی دەکرد کە تێیدا دەژین وەك چۆن تەماشای شوێنێك بکات بۆ گۆشەگیری بشێت و، دانیشتووانیشی بەلاوە بە نەخۆشانێکی ترسناك دادەنا کە شتێکی دژوارە چاك ببنەوە، بۆیە لەچوارچێوەی ڕێ و شوێنی دیاری کراوو سزاو تۆقاندن و جیاکردنەوەی جەستەیی و ناکاری، پێویستە تا دەکرێت دوور لە جیهانی بەڕێزو دروست بپارێزرێن و دوور بخرێنەوەو، لە هەموو شتێکدا هەقیان بەسەریانەوە نەبێت. ڕێیان نەدرێت لە بازنەی خۆیان بچنە دەرەوەو، ئەگەر پێویستیشی نەکرد بە وێزەیان نەکەون، چونکە ئەو پێوەندییە هیچ شتێکی باش و ماقووڵی لێ ناکەوێتەوە.

بەڕێوەبەری نوێ هات بە هەموو تواناو هەڵس و کەوتەوە شێوازێکی جیاواز پێڕەو بکات. چونکە لە یەکەمین ساڵەوە، کاتێك باوکی مرد، لەتیف خانووە جوان و گەورەکەی باوکی لە گەڕەکە نوێیەکەدا فرۆشت و، زەوییەکی چۆڵ و بەرفرەوانی نزیك بە گۆڕەپانە نەفرەتییەکە کڕی، پڕ لە پەیکەر بوو، لە دوورگەیەکی چۆڵ یان گۆڕستانێکی کۆن دەچوو، زەوییەکی بەگەنم چێنراوو، دارستانێك دارو درەختی بەردارو، سستمێکی تەواوی شوورەو دیواری بەرز لە گۆڕەپانە نەفرەتییەکەی جیا دەکردەوە.

لێرەدا لە تەنیشت ئاوی سازگارو زۆرەوە، لەناو دارو درەختە بڵندەکاندا خانوویەکی جوان دروست کرد بەسەر لایەکی دیکەی دۆڵەکەیدا دەنواڕی، ئەمەیش وای لێ کرد بای باشوورو بۆنی گەنیوی ناتەندروستی لێوە دوور بوون کە لە بەندەرو جبەخانەکەوە هەڵیان دەکرد.

خانووەکە ئەوەی باشبوو زۆر لە گۆڕەپانە نەفرەتییەکەوە نزیك بوو لەهەمان کاتیشدا زۆری لێوە دوور بوو، چونکە بەدیەن و هێوری و چاك و تەمیزی جیهانێکی دیکەی دەنواند، بەهەزاران میل لە گۆڕەپانە نفرەتییەکەوە دوور بوو. لەهەمان کاتیشدا لە تەنیشتییەوە بوو، بەشێوەیەکی نەبینراو پێوەی بەسترابووەوە، چونکە خاوەندەکەی چەند ڕێگەیەکی بچووکی بەکار دەهێنا کەسی پێدا نەدەڕۆیشت تەنیا ئەو نەبێت. بەم شێوەیە قەرەقۆز دەیتوانی هەموو کاتێك لە ماڵەکەی خۆیەوە بچێتە ناو گۆڕەپانە نەفرەتییەکەوە بێ ئەوەی کەس بیبینێت. (بۆیە نەدەزانرا چ کاتێك لەوێیەو چ کاتێك لەوێ نییەو، چ کاتێك و چۆن لەناکاو لێرە هەڵدەتۆقێت و پەیدا دەبێت). بەڕێوەبەر بەردەوام سوودی لەم توانایە وەرگرت. بەخۆی چاودێری گیراوو پاسەوانەکانیانی دەکردو، بە وردی ڕابوردوو و ئێستەو تاوانی هەر یەکە لە دیلەکانی دەزانی و باش دەیناسین. بۆیە لەسەر هەق بوو کاتێك گوتی (دەزانم چۆن ئەم گۆڕەپانە هەناسە دەدات). هەر کاتێکیش کەسێکی بە ڕواڵەت نەناسیبایە ئەوە لە ناخەوە، لە گیانی دەربەدەرو تاوانکارو لە یاسا لادەری دەیناسی، دەشیتوانی لەهەر کاتێکدا بێت لەبەردەمیدا ڕاوەستێت و لەمەڕ تاوانەکەی یان تاوانی کەسێکی دیکە درێژە بە قسەکانی بدات، بەهەمان شێوە، بەڵکو باشتریش هەموو پاسەوانێکی بە لایەنێ چاکەو خراپەوُ ڕەوتە ڕاگەیەنراو یان نهێنییەکانییەوە دەناسی.

بەردەوام ئەو شتەکەی دەگوت و شانازی بە خۆیەوە دەکرد. بەم شێوەیەیش بە درێژایی تەمەنی خۆی پێوەیدندییەکی پێویستی بە جیهانی تاوان و لەڕێلادانەوە هەبوو کە لەسەردەمی هەرزەکارییەوە تا هەتایە وازی لێ هێنابوو، بۆیە کۆنترۆڵی کردبوو، لێوەیشی دوور بوو، پلەو پایەو باخچە چڕوپڕو شووورە بەرزو دەرگەکانی کە کەسی دیکەیان پێدا ناڕوات لێوەی دوور خستبووەوە.

قەرەقۆز هەر لەسەرەتاوە (لەناوەوە)کاری کرد. بەشێوازی ناسروشتیانەی خۆی لەکارکردندا دڕندەو دڵڕەق و ترسناکتر بوو، بەشێوەیەکیش زۆر جار لەبەڕێوەبەرەکانی پێشووی خۆی مرۆڤانەتر بوو. لەچوارچێوەی ئەم شتە دژ بەیەك و بەناو یەکداچووانەی کە کۆتاییان نایەت و ناکرێت بگیرێن، پێوەندی بەگۆڕەپانە نەفرەتییەکەو هەموو ئەو

نادەمیزادانەوە هەیە کە وەك ڕووبارێکی لەسەرخۆی لیّل بەویّدا تیّدەپەڕن. تەنانەت کۆنترین و فیّلبازترین میوانانی گۆڕەپانە نەفرەتییەکە دەزووەکانی یارییەکەی قەرەقۆز بگرن یان تیّی بگەن.

بریتی بوو لە تەنیا یارییەکی خودی، پڕ لە پیّچ و پەناو بیرو هزری بویّرانەی پیّشنبینی نەکراوو هەندیّك جاریش دژ بەیاساو شیّوازەکانی کاری پۆلیس و هەر هەموو نەریت و ڕەفتارو هەلسوکەتی کۆمەلایەتی. هەرلە یەکەمین سالەوە نازناوی (قەرەقۆز)ی بەبەردا برا. بۆیە بە ڕاستی گۆڕەپانەکە بەهەموو ئەوانەی تیّیدا ژیان و، بە هەموو ئەوەی تیّیدا ڕووی دا، بریتی بوو لە شانۆیەکی گەورە کە ژیانی قەرەقۆزی دەنوواند.

جا لەبەر ئەوەی هەر بە لاوی لەشی دازایی و قەلەو بوو، هەروەها تووکن و گەنم ڕەنگ بوو، بۆیە خیّرا پیری ڕووی تیّکرد، بەلایەنی کەمەوە لە ڕووی شیّوەوە. شیّوەکەی دەکار مرۆڤ فریو بدات. ئەگەرچی ئەوەندە قەلەو بوو نزیکەی سەد هۆقە قورس بوو (هۆقە یەك کیلۆو چارەکە کیلۆیەکە، هۆقەیش هەبوو چوار کیلۆ بوو - وەرگیّڕ)، بەلام ئەگەر پیّویستی بکردایە ئەوە چوون **(مووشی خورما)** چالاك و خیّرا دەبوو. ئەو تەنە قورسە داهیّزراوەی توانی لە چەند ساتیّکدا وەك ئەو ساتانە هیّزیّکی چوون هیّزی گا بجولقیّنیّت. لەودیوی ئەو دەم و چاوە بیّ گیان و خەوالوو و ئەو چاوە نیوچە نووقاوانەوە وریاییەکی ئاگەدارو ئامادەگییەکی ئیبلیسیانەو هزری پتەو خۆیان حەشار دابوو. ڕیّك نەکەوتبوو هیچ کەسیّك هەرگیز بزەیەك بەسەر ئەو ڕووە زەردە تاریکەوە ببینیّت، تەنانەت ئەو کاتەیش کە هەموو جەستەی قەرەقۆز لە ناوەوە لەبەر قاقای پیّکەنین دەهەژییەوە. دەشیا ڕووی قەرەقۆز بگۆڕیّت و گرژ بیّت، تووڕەیی و ئیّش و ئازاریّکی زۆر بنویّنیّت بۆ لیّکگەیشتنیّکی قوول و دلنەواییەکی ڕاستگۆیانە بگۆڕیّت. یاری چاو یەکیّك لە بەهرەکانی قەرەقۆز بوو. چونکە بەردەوام چاوی چەپی نووقابوو، بەلام بە پیّلووە پیّکەوە نووساوەکانی وای هەست پیّدەکردیت کە تیڕوانیّکی تیژی چوون چەقۆی هەیە. چاوی ڕاستیشی زەق زەق دەیڕوانی، وەك بلیّیت تەنیا بە خۆی بۆ خودی خۆی دەژیت و، وەك چەپکیّك ڕووناکی تیژ دەجوولایەوەو دەیتوانی لە کاسەی خۆی بیّتە دەرەوەو زۆر

خێرایانە بچێتەوە شوێنی خۆی، ئەوەیش هەستێکی وای لای قوربانی دروست دەکرد کە هێرشی دێنێتە سەر، ئیدی لەخۆڕا دەستەپاچە دەبوو، لە شوێنی خۆی ڕادەوەستاو، هەستی دەکرد کە شتێك بە ناخیدا دەچێت بۆ ئەوەی وردترین یان قووڵترین هزرو هیواو ئاوات و پلانەکانی بخوێنێتەوە. بەو چاوە، ئەو دەم و چاوە ناشیرینە ساتێك شێوەیەکی ناشیرینتری دەنواندو ساتێکی دیکە جێی گاڵتەجاڕی بوو.

بەندییەکان کاتێك قسەیان لەبارەی قەرە قۆزەوە بکردایە، هەموو شتێکی وردیان لەبارەوە باس دەکرد، زۆرتریش باسی هەردوو چاویان دەکرد. هەندێکیان دووپاتیان دەکردەوە کە هیچ بە چاوی چەپی نابینێت، هەندێکی دیکەشیان بە پێچەوانەوە دەیانگوت بەو چاوە ڕاستە دەرپۆقیوەی هیچ نابینێت. لە ماوەی بیست ساڵدا نەیانتوانی لەسەر ئەوە ڕێك بکەون. بەڵام هەر هەموویان لە ڕوانینی ئەو دوو چاوە دەلەرزین و تا بۆیان بکرایە خۆیان لێ دەدزییەوە.

ڕوخساری قەرەقۆز هیچ ڕادەیەك شکۆی عوسمانلی پێوە دیار نەبوو کە بەرپرسان هەیانبوو، تەنانەت نە بە شێوازی قسەکردن و ئاخافتن یان جم و جووڵەکانی. لەگەڵ هەر حاڵەت و لەگەڵ هەر گومان لێکراوێکدا یارییەکی تایبەتی دەکرد، بێ ئەوەی شەرم بکات یان ڕەچاوی هیچ شتێك بکات، بەبێ ئەوەی ڕێز لەو کەسە یان لە خودی خۆی بگرێت. بەردەوام بە شێوەیەکی کوتوپڕو بەهرەوەرانەو سروش وەرگرتنەوە کاری دەکرد. شەو یان ڕۆژ بووایە هەڵی دەکوتایە سەرو لەو کەسە یان کۆمەڵێك بەندی نزیك دەبووەوە.

- بخی... بخی... بخی... بخی..ی.. ی..!

ئەو پیت و بڕگانەی بە دەنگی بەرزو چڕ و ڕیتمی دەنگی جۆراوجۆر لە زار دەردێناو، هەر جارەی بە شێوەیکی جیاواز لەوەی پێشوو، بەردەوام لە خۆی و لەو کەسەیش سەری سوڕ دەما، لەو هەموو شتانەیش کە لە نێوانیاندایە.

- چی؟ هێشتە لێرە خەریکی بۆگەن دەبیت؟ بخی.. ی.. ی.. ! پێم بڵێ ئەوە چۆن ڕووی دا؟

بەم شێوەیە دەستی بە ئاخافتن دەکرد کە هەرگیز نەدەتوانرا شێوازی بەردەوام بوونی بزانرێت. دەشیا لێپرسینەوەیەکی دوورو درێژ بێت بۆ ئەوەی هەموو وردەکارییەکان بزانێت، لەگەڵ هەڕەشەی دژواردا کە زۆر جار هەر بە هەڕەشە دەمایەوە، بەڵام لەو جۆرە

بوو که دەبوو هەر یەکەیان لە هەمان کاتدا ببێتە ڕاستییەکی لەرادەبەدەر. هەندێك جاریش شێوەی قایل کردنێکی سووربوونی ترسناکی لەخۆ دەگرت کە مرۆڤ ناتوانێت بەرەنگاری ببێت، هەندێك جاری دیکە شێوەی شانۆگەرییەکی گاڵتەجاڕی بێ گیانی لەخۆ دەگرت، بێ ئەوەی هیچ مەبەست یان واتایەك ببەخشێت.

ئەگەر ئەو پیاوە ئازاردراوو فشار لەسەرە بکۆشیبایە بێ تاوانی خۆی نیشان بدات و، نارەزووی بکردایە تەنیا بۆ ساتێکیش بووایە خۆی لە فشاری قەرەقۆز قوتار بکات و، ڕاوەستایەو بپاڕابایەوەو بە گریانێکی ڕاستەقینە یان درۆکینە بێ تاوانی خۆی دووپات بکردایەتەوە، ئەو کات قەرەقۆز شێوەی خۆی دەگۆڕی و، بە ناوچاوانی خۆیدا دەکێشا:

ـ چی دەڵێیت، تاوانبار نیت، هەڵەت نەکردووە؟ ئاخ، تۆو خوا چۆن توانیت هەر ئێستە ئەمەم پێ ڕابگەیەنیت؟! بخی.. بخی.. ی..ی !! ئەگەر ئێستە دان بە تاوانەکەی خۆتدا بنێیت و ئاگەدارم بکەیتەوە ئەوە دەتوانم ئازادت بکەم چونکە ئەوانەی هەڵەیان کردووە لێرە زۆرن، بەڵام ئێمە تەنیا پێویستمان بە یەك بێ تاوان هەیە. بۆیە ناتوانم ئازادت بکەم. ئەگەر تۆ خۆت بە زمانی خۆت ئەوەت نەگوتبایە ئەوە دەتوانین شتێکت بۆ بکەین، بەڵام هەرچی بەم شێوەیەو ئێستە ئەوە پێویستە لێرە بمێنمەوە تا پیاوێکی بێ تاوانی وەك تۆ بدۆزمەوەو تۆی لەگەڵدا بگۆڕمەوە. لەبەر ئەوەیە دانیشەو خۆت کڕ بکە!

لەکاتێکدا قەرەقۆز بە یاوەری هەندێك لە پاسەوانەکانی بە گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا دەسووڕایەوە درێژەی بە یاری و هاوارەکەی دەدا، تا ڕادەیەك وا دەهاتە پێش چاو کە بەسەر خۆیدا دەقیڕینێت، ئەویش بەشێوەیەك هەموو شتێکی دەهێنایە لەرزین، بە شێوەیەك نەدەکرا ڕابگیرێت و بووەستێنرێت.

ـ هەموو ئەوەی لێم دەوێن ئەوەیە کەستان سەبارەت بەوی دیکە پێم نەڵێن ئەو بێ تاوانە. نا. لەبەر ئەوەی لێرە کەس نییە بێ تاوان نەبێت. بە ڕێکەوتیش بێت کەس نییە. مادامەکێ هەر یەکەتان پێی لەم دەرگەیە ناوەتە ژوورەوە ئەوە بێ تاوان نییە. تاوانێکی کردووە، تەنانەت ئەگەر لە خەونیشدا بوویێت، یان دەکرێت کاتێك دایکی بێزۆوی پێوە کردووە، بەلایەنی کەمەوە بیری لە شتێکی خراپ کردووەتەوە. هەر یەکە لە ئێوە لافی

ئەوە لێ دەدات کە هیچ تاوانبار نییە. بەڵام لەماوەی ئەو ساڵە دوورو درێژانەدا کە لێرەم بەسەر بردوون مرۆڤێکم نەبینی بێ هۆکارو بێ تاوان هێنرابێتە ناو ئەم شوێنەوە. بەڵێ! ژمارەیەکی زۆر خەڵکیم ئازاد کردووە. هەندێك جار بە فەرمانی لەسەرووی خۆمانەوە، هەندێك جاری دیکەیش لەسەر بەرپرسیاریەتی خۆم. لێرە بێ تاوان نییە، بەڵکو هەزاران تاوانبار هەن کە لێرە نین و هەرگیز ناشیەن، چونکە ئەگەر هەموو بێ تاوانێك بهێنینە ناو ئەم شوێنەوە دەبوو ئەم گۆڕەپانە لە کەناری دەریاوە تا کەناری دەریا بووایە. من خەڵکی باش دەناسم، هەموویان تاوانبارن، بەڵام لەچارەی هەر یەکەیان نەنووسراوە لێرە نان بخوات.

کە ڕێی دەکرد ئەم مەنەلۆژەی دەیگێڕایەوە، وردە وردە خێراترو چوست و چالاکانەتر دەبوو، تا دەبووە هاوارێکی شێتانەو جنێودان بە هەموو بەندکراوێکی ناو گۆڕەپانەکەو هەر هەموو ئەوانەی لەدەرەوەیش دەژین. لەئاکامی ئەم هاوارە بەرزەو، ئەم بەچاوی سووك تەماشاکردنەی هەموو شتێك، گرژییەکی تێکەڵ بەگریانی نەبیستراوو داخ و پەژارەیەك لە دەنگیدا هەستی پێ دەکرا چونکە بارودۆخەکە بەم شێوەیەیە.

وای لێدێت بێ تاوان لەوە دڵنیا دەبێت کە مانەوە لێرە چەندین هەفتە دەخایەنێت بێ ئەوەی جارێکی دیکە قەرەقۆز ئاوڕی لێ بداتەوە.

هەندێك جار پاش ئەو ڕووداوە بەچەند هەفتەیەك وا ڕوو دەدات کۆمەڵێك خزم و کەسوکاری بەڕێزی لاوێکی دەوڵەمەند دێن، کە لەگەڵ برادەرە خراپەکانیدا گیراوە، بۆ ئەوەی لە قەرەقۆز بپاڕێنەوە لاوەکە ئازاد بکات لەبەر ئەوەی بە ڕاستی بێ تاوانە، بۆیە دەیبینیت کوتوپڕ دەگۆڕێت، وەك بڵێیت هەنووکە شتێکی گرنگی بیرکەوتووەتەوە، بیر دەکاتەوەو خۆی بە شێوەیەکی جیدی دەنوێنێت و، ساتێك هەردوو چاوی دەنووقێنێت ئەو کات دەم و چاوی درێژ دەبێتەوەو، ڕوخساری دەگۆڕێت، پاشان بەوپەڕی ڕێزەوە بەرانبەر بە نزاکاران دەنووشتێتەوەو، دەنگی بەرز دەکاتەوە:

ـ بەوانەتان گوتووە کە بەندیان کردووە ئەم لاوە بێ تاوانە؟

ـ گوتوومانە. چۆن نەمانگوتووە! بەڵام...

ـ ئـای هەڵـەتان کـردووە. بخـی.. بخـی.. ێ.. ێ..! باشـتان نـەکردووە، ئەوانـە هەنووکە تەنیا بێ تاوانەکان دەگرن، کەچی تاوانبارەکان ئازاد دەکەن. سستمی نـوێ بەم جۆرەیە. جا لەبەر ئەوەی ئێوە خۆتان بەرانبەر بە بەرپرسان گوتووتانە بێ تاوانـە بۆیە پێویستە لێرە بمێنێتەوە.

خەڵکەکە بە پەشۆکاوی و قایلبوونێکی ئارامەوە تەماشای یەکدی دەکەن، پێشبینی ئەوەیش دەکـەن قـەرەقۆز پێبکـەنێت و کارەکـە بکاتـە نوکتەیـەکی سـەرپێیی. کـەمێك پێدەکەنن، بەڵام ئەو بە جیـدی و سـوور لەسـەربوون و سـاردو سـڕ هاوسـەنگی خۆیـەوە دەمێنێتەوە. بەم شێوەیە بەڕێیان دەکات. بۆ ماوەیەکی زۆر ناتوانن بێنـەوە سـەرخۆیان. بەسـەرهات لەبەردەم برادەرو دۆستەکانیاندا دەگێڕنەوە، دەچن و لای خزمە بەرپرسەکانیان نارەزایی دەردەبڕن ئەوانەی شان هەڵدەتـەکێنن و دەسـت بـڵاو دەکەنـەوە وەك خـەڵکانێك بڕوایەکی تەواویان بەوە هەبێت کە ئیبلیس بـەخۆی لـەناو کـەوڵی قەرەقۆزدایـەو ئـەویش لەودیوەوە دەپەیڤێت، خۆزگە یەك ئیبلیس دەبوو.

قەرەقۆز دەتوانێت سبەینێ، کاتێك بەناو گۆڕەپانەکەدا دەسووڕێتەوە، چاوی بەو (بێ تاوانە) بکەوێت و لەناکاو درێژە بە قسەکانی بدات کە بەر لە سێ هەفتە لەگەڵی دەستی پێکردبوو. خێرا لێی نزیك دەبێتەوە، بەرانبەری قیت دەبێتەوە، وای تەماشا دەکـات وەك بڵێیت قووتی بدات.

ـ بخی! خۆت بەچی دەزانیت؟ تا کەی بۆنە بۆگەنیوەکەت لێرە بـڵاو دەکەیتـەوە؟ وەك بڵێیت بێ تۆ بۆنی گەنیو نەبێت! ملت بشکێنەو بڕۆ، گوێت لێیە؟ شڕو سـیپاڵت کۆکـەوە بۆ ئەوەی جارێکی دیکەت نەبینمەوە، چونکە ئەو کات فـەرمان دەدەم چـوون پـشیلەیەك دارکاریت بکەن.

لاوەکە، کە لەسـەردتاوە لەبەر کوتوپڕی ڕووداوەکە لە شـوێنی خۆیـدا وشـك هـەڵات، هەموو هێزو توانـای وەبـەر خـۆ دەهێنێتـەوەو، لـە گۆڕەپانەکـەوە دزە دەکاتـە دەرەوەو، لەدووی خۆی هـەموو شـتە بـچووکەکانی بـەجێ دەهێڵێـت تـا پاسـەوان و بەنـدکراوەکان تالانیان بکەن.

قەرەقۆز دەیتوانی چەندین سەعات لەگەڵ تاوانبارێکدا بەسەر بیات بە دزی یان فێڵ کردن یان دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەت یان پێشێل کردنێکی گەورەی یاسا یان پیاوکوشتن تاوانبار کرابێت، ئەویش بە هاوارکردن یان قیڕاندن یان بە چرپەوە. یان ڕۆڵی گێل یان تۆڵەستێن یان مرۆڤێکی بە بەزەیی لێگەیشتوو ببینێت، هەر هەموو ئەوەیش بە نۆرەو بەو ڕاشکاوی و قایل کردنەوەوە. هەندێك جار زۆرانی لەگەڵ پیاوەکەدا دەگرت یان دەستی لە مل دەکرد یان فەلاقەی دەکرد یان یاری لەگەڵ دەکرد، لەهەردوو باریشدا بە ڕوویدا هەڵدەشاخی و دەیگوت: (ددانی پێدا بنێ، خوا خەمت نەداتێ! ددانی پێدا بنێ و خۆت قوتار بکە، چونکە وەك دەبینی لە خەم و خەفەتاندا وشك هەڵدێیت، ددانی پێدا بنێ!).

کاتێك دەگاتە ئامانجەکەی و ددان پێدانانەکەی وەردەگرێت و، زانیاری لەبارەی بەشداربووان یان ئەو شوێنەوە وەردەگرێت کە پارە دزراوەکەی تێدا شارراوەتەوە، ئەو کات هەردوو لەپی لێك دەسوێت، وەك پیاوێك ئاکام کارێکی خراپ و نەگریسانەی کۆتا پێ هێنابێت، ئەو کات هەموو دەمامکەکان لا دەبات چونکە پێویست ناکەن و، پرسەکە بۆ بەدواداچوونی یاسایی بەجێ دەهێڵێت. بەڵام تەنانەت لەو کاتەیشدا پیاوەکەی لە یاد نەدەچوو یان ئازاد نەدەکرد کە ئاکام ددانی پێدا ناوە. بەڵکو زۆر جار لەو ددان پێدانانەی یارمەتی دەداو ئاسکاری بۆ دەکردو باری سووك دەکرد.

ناکرێت لەم یارییە سەیرەی بگەیت کە کۆتایی نایەت. وا پێدەچێت لە هەموو ژیانیدا بۆ جارێکیش بووبێت بە ڕاستی بڕوای بەیەك کەس کردبێت، نە تاوانبارو نە شایەتەکان و نەیش بەخودی خۆی. بۆیە هەستی بە پێویستی ددان پێدانان دەکرد وەك تەنیا خاڵێکی هەمیشەیی کە بە هۆیەوە دەتوانێت دادوەرییەکی ڕاستەقینەو سستمێك بپارێزێت کە هەرچۆنێك بووبن، لەم جیهانەی کە هەر هەموو کەسێکی تێدا تاوانبارەو پێویستە هەموویان سزا بدرێن. بۆیە بەدوای ئەو ددان پێدانانەدا دەگەڕاو بە کۆششێکی نائومێدانەوە دەیگرت و لە مرۆڤی دەردەهێنا، وەك بڵێیت لە پێناوی ژیانی تایبەتی خۆیدا کار بکات و کارەکانی خۆی پێ یەك لا بکاتەوە کە لەگەڵ شەڕ و لەڕێ لادان و فێڵ کردن و کەم گوێ ڕایەڵیدا یەك لا ناکرێنەوە.

وا پێدەچوو ئەو یارییەی لەهەندێك باردا بێ واتا بێت و، کەس لێی نەگات و بەگونجاو نەزانرێت. چونکە لەبەر هەژاری و گۆڕان نوێ دەهاتە پێش چاوو بە شێوەیەکی ژیرانە دارێژرابوو، بەردەوامیش بە ئاکام دەگەیشت. دووبارەو ڕۆتینی تێدا نەبوو. بەردەوام نوێ بوو، هەمان کات لە خۆیەوە چرۆی دەکرد. بۆیە سەری لە دڵڕەقترین و بلیمەترین و شارەزاترین میوانانی گۆڕەپانە نەفرەتییەکەی شێواندبوو. هەندێك جاریش لێی نەدەگەیشتن تەنانەت لە لایەن ئەوانەیشەوە ماوەی چەند ساڵ بوو لەگەڵ قەرەقۆزدا کاریان دەکرد. بۆیە لەشاری ئەستەنبوڵ چەندین سەربوردەو حەکایەتیان لەبارەوە هۆنیبووەوە. هەڵسوکەوتەکانی وەك کارێکی بێ هوودەو هەندێك جار تا ڕادەیەك نامرۆییانەو، هەندێك جاری دیکە شل و خاوی پێشبینی نەکراوو پڕ لە سۆزو لێك گەیشتن دەهاتنە پیش چاو.

بۆیە سکاڵایەکی زۆر لە قەرەقۆز دەکرا، تەنانەت پرسی گۆڕینیشی خرابووە ڕوو. چەند جارێك وەزیرەکان لە ئەنجوومەنی وەزیران لە بارەی ئەوەوە وتووێژیان کردبوو، ئاکامیش هەموو شتێك وەك خۆی دەمایەوە. هەموویان دەیانزانی کە قەرەقۆز بەڕێوەبەرێکی ئارەزووکارانەی سەیرەو بە ئارەزووی خۆی کار دەکات. بەڵام هاوکات لەوە دڵنیا بوون کە ناتوانن وا بە ئاسانی پیاوێکی وەك ئەو بدۆزنەوە، کە بەرەو ڕووی جیهانی دزو جەردەو دەربەدەرو هەموو جۆرە لەڕێ لادەرێك بووەستێت و، شەوو ڕۆژ کار بکات بۆ ئەوەی بەم شێوەیە ڕێك و پێکە لە گۆڕەپانەکەیدا بیانپارێزێت. بەم شێوەیە قەرەقۆز لە شوێنەکەی خۆیدا مایەوە تا بە شێوازی خۆی گۆڕەپانە نەفرەتییەکە بەڕێوە ببات.

هەمووان تەنانەت ئەوانەی ناو گۆڕەپانە نەفرەتییەکە وایان بەباش زانی کە ئەم چارەسەرییە باشترین چارەسەرییە. ئەوەبوو بەردەوام قسە لەبارەی قەرەقۆزەوە دەکراو لە پشتە ملە باسیان دەکردو گاڵتەی پێ دەکراو جنێوی پیدەدراو هەندێك جاریش هێرشی دەکرایە سەر بۆ ئەوەی دەستدرێژی بکرێتە سەر.

(جنێوی کیژەکەی قەرەقۆز لە گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا لەهەموو بۆنەیەکدا بوو بە ڕەفتارێکی هەمیشەیی و بەردەوام). تا ڕادەیەك خەڵك وەك بڵێیت سیحریان لێ کرابێت

بۆ هەواڵەکانی گوێ قوڵاغ بوون، هەر هەموو هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی و، هەموو ڕوانینێك و هەموو وشەیەکیان شی دەکردەوە. لێی دەترسان و،تا بۆیان بکرایەو بیانتوانیایە خۆیان لە دیداری دەدزییەوە. بەڵام خودی ئەو خەڵکە قسەیان لەبارەیەوە دەکرد وەك بڵێیت بەشێوەیەکی ددان پێدانەنراو پێی شاد بن و لەمەڕ ناشایستەترین سەرکەوتنەکانی دەپەیڤین. هەموویان بە قەرەقۆز ڕاهاتبوون و بە شێوازی خۆیان بەهۆی ئەوەوە یەکیان گرتبوو. جنێویان پێ دەدا وەك چۆن جنێویان بەو ژیانە دەدا کە خۆشیان دەویست لەگەڵ ئەو چارەنووسەی لە تەوێڵیان نووسراوە. ئەو بەشێکی نەفرەتەکەیان بوو، ئەوانیش لەو بارە گرژو ڕق لێبوونەوە بەردەوامەدا بوون، تا بوونە بەشێك لەو، تا ڕادەیەك شتێکی دژوار بوو مەزەندەی ژیانێکی بێ ئەو بکەن. لەکاتێکدا کە دەبوو گۆڕەپانی نەفرەتی هەبێت، بەڕێوەبەریش بەڕێوەی ببات، ئەوە ئەم پیاوە بەم ڕەفتارو هەڵس و کەوتانەوە لە یەکێکی دیکە باشترە. وێڕای سەیرو سەمەرەی شێوازی کارکردن و ناشایستەیی بەلای هەندێکی کەسی دیکەوە، ئەوە ئەو شێوازە شێوازێکە بەردەوام پێشبینی شت و ڕووداوی کوتوپڕی لێ دەکرێت، چ بە چەمکی باش یان خراپ. ئەم شێوازە بلیتێکی بەردەوامی خۆت و بەختەو بووەتە هۆی ناسەقامگیری بەردەوامی بەندییەکان. هەموو ئەو شتانەیش لە ئاکامی ئەوەوە سەرهەڵدەدەن وا لە خودی قەرەقۆز دەکەن هێورتر بێت و سنگ فرەوانتر بێت، یان بە لایەنی کەمەوە وایان دێتە پێش چاو، مادامەکێ هەموویان حەزیان لەقومارکردنەو، بەردەوام خۆیان لە سەقامگیری دەدزنەوە، کە بەلای ئەوانەوە دژوارە. هەموو تاکێکی ئەم جیهانە شەڕەنگێزو لەڕێ لادەرو هەڵبژاردەیە لەو بڕوایەدایە کە قەرەقۆز شتێکە تەنیا پێوەندی بەوانەوە هەیە. ئەو هی ئەوانە: (بەراز)، (زارووی خوێنمژ)، (سەگی کوڕی سەگ)ە، بەڵام موڵکی ئەوانە.

ئەمە لەتیف ئاغایە کە ناوی (قەرەقۆز)ە. ڕەنگە باشتر وابێت بگوترێت کە ئەوسا بەو شێوەیە بووە چونکە ئێستە بەنێو ساڵدا چووە. قەڵەوتر بووە، زۆر لە چوست و چالاکی جارانی لەدەست داوە، ماندوو دەبێت، بەڵام هێشتە شتی کوت و پڕ لە بۆ گۆڕەپانەکە دەخاتە ڕوو، بە خەیاڵ و ڕێو شوێنی باش و، هەڵس و کەوتی سەیرو

نامۆو، سزاو چارەسەرە دروستەکانی چوون پێغەمبەر سلێمان گۆڕەپانەکە وا لێ دەکات واقی وڕ بمێنێت. ئەوەتە ئێستە لەو لێوارە جوان و بەتەندروستەی ئەم کەنارە دانیشتووە، لەو خانووە جوانەی تێیدا ژنی بۆ کوڕەکانی هێناو کچەکانی تێدا بەمێرد دان.

تەنیا جاروبار قەرەقۆزە کۆنەکە لە ناخەوەیدا دەردەکەوت، ئەو کاتەی کارێکی لەرادەبەدەری لەبەردەم نیشتەجێبووانی گۆڕەپانەکەدا ئەنجام دەدا ئەوانیش سەریان لێ سوڕ دەماو، زەندەقیان لێ دەچوو، وەك چۆن بەر لە دە یان پازدە ساڵ کاری وای ئەنجام دەدا.

بە تێکەڵەیەکی سەیری سەرسوڕمان و تاڵییەوە دوای هەموو ئەو ساڵە دوورو درێژانە ئەوە لە دەنگ و وشەکانی قەشە پیتەردا هەستیان پێدەکرا، کە بە دوورو درێژی سەبارەت (شەڕخوازە بەساڵداچووەکە) دەدوا، ئەو کاتەی ـ بەبەرچاویانەوە ـ خەریکی لێپرسینەوەی پیاوێکی ئەرمەنی بوو، لەسەر ئەوە گیرابوو گوایە میتاڵی دراو لێدانی لە کارگەی حکوومی دراو لێدان دزیوە.

ئەو میتاڵە گرانبەهایە لە کارگەی دراولێدان وردە وردە کەمتر دەبووەوە، بەڵام بە شێوەیەکی بەردوام، ناکام هەواڵەکە بەر گوێی سوڵتان کەوت، بەوپەڕی تووڕەییەوە هەڕەشەی ئەوەی کرد کە هەموو بەرپرسە گەورەکان سزا دەدات ئەگەر دزییەکە ڕانەگیرێت و دزەکان نەگیرێن و دەوڵەت قەرەبوو نەکرێتەوە. ئەو کات حکوومەتە لەرزۆکەکە ژمارەیەکی زۆر گومان لێکراوو کرێکارانی خودی کارگەکەی بەندکرد، پاش ئەوەیش خێزانێکی ئەرمەنی دەوڵەمەند بە تەواوەتی بەند کرد کە چەند سەجەرەو لق و پۆیان هەبوو هەموویان بازرگانییان دەکرد، پاش ئەوەی دەزووی لێکۆڵینەوەکان گەیشتە دوکانەکانیان. بۆیە هەشت پیاوی ئەو خێزانە ڕاپێچی گۆڕەپانە نەفرەتییەکە کران، لەوێ ئەو پیاوە ئەرمەنییە ڕەنگ گەنمی و، مەیلەو قەڵەوانە، وەك کەسانێکی دەوڵەمەند ژیانی خۆیان لە هەموو ڕوویەکەوە ڕێکخست. چەندین ناومالەو قەنەفەو قەرەوێڵەو نوێن و پێخەفیان هێنا. ڕۆژانە خواردنێکی زۆریان بۆ دەهێنرا، کەس توخنی نەکەوتن یان لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکردن. کاتێك کارەکە خەریك بوو بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت قەرەقۆز یەکێك لەپاڵەوانییەتییەکانی خۆی نواند لەوانەی لەکاتی لاوێتیدا ئەنجامی دەدان.

بەیانیانێکیان کاتێك سەرۆکی ئەو خێزانە گریگۆری بەساڵداچووی نەخۆش بە تەنگەنەفەسی لە گۆڕەپانەکەدا لەسەر تەختێکی دانراوی ناو پێچێکی دیواری بەندیخانەکە دانیشتبوو، لەناکاو بەرێوەبەر دەرکەوت و، لە تەنیشتییەوە لەسەر ئەو تەختە بچووکە دانیشت کە بە ئاستەم جێی یەك کەسی لێ دەبووەوە. بێ ئەوەی یەك ورتەی لە زار بێت دەر بەهەموو قورسایی لەشی دەستی بە پاڵەپەستۆخستنە سەر گریگۆر کردو، بەرەو دیوارەکە تەنگی پێ هەڵچنی، پاڵەپەستۆی دەخستە سەرو تا دەهات هەناسەی لێ دەبڕی، ئەوێك کە بەخۆی بە زەحمەت هەناسەی دەدا. کاتێك بە گوشراوی بە گۆشە بەردینەکەوەی نووساند، بێ پێشەکی، بە دەنگێکی هێور بەڵام لەرادەبەدەر گوتی:

- گوێ بگرە، پرسەکە پرسێکی گەورەیە، پێوەندی بە دەربارەوە هەیە، پێویستە بە زووترین کات یەك لا بکرێتەوە. بەرپرسە گەورەکان، کە کەسانێکی بێ تاوانن، لە پێناوی ئێوەدا سەریان لە دەست دەدەن. تۆ ئەرمەنیت، کەواتە تۆ کابرایەکی نەگریسیت و باش تێدەگەیت. منیش بە لایەنی کەمەوە بە سێ ئەرمەنی هاوسانم. جا وەرە با هەر (چوار)مان دەروازەو چارەسەرێك بۆ ئەم کێشە ئاڵۆزو زۆر ترسناکە بدۆزینەوە. هەر هەموو ئەو دزە زۆرە گیراوانە هیچ نین و، ناتوانن زیانەکان قەرەبوو بکەنەوە، بۆیە سەریان تێدا دەچێت. هەرچی ئێوەیە کە هەموو شتێکتان هەڵلووشیوەو بە نرخی تۆڵەکە شتە دزراوەکانتان کڕیوە، ئێستەیش دەتوانن سەری خۆتان قوتار بکەن و خۆتان بکڕنەوە. من دەزانم تۆ تاوانبار نیت بەڵکو کەسێکی دیکەی خێزانەکەی تۆیە. بەڵام تا هەموو ئەو شتانە دەدۆزرێنەوە کە دزراون و بۆ گەنجینەی سوڵتان دەگەڕێنرێنەوە ئەوە تۆ تاوانباریت. وەرە با کۆتایی بەهەر هەموو ئەوە بهێنین. ئەگینە بە ئاین و بە بڕوام سوێند بێت لە ژێر ئازارو ئەشکەنجەدا گۆشتی لەشت توێ توێ دەبێتەوە، چەندی گۆشت بە لەشی منداڵێکی دە ساڵانەوەیە ئەوەندەت بە لەشەوە نامێنێت.

پیرەمێردە ئەرمەنییەکە کە پاڵەپەستۆی خرابووە سەر نەیتوانی هەناسە بدات یان یەك وشەی لەزار بێتە دەر، لە کاتێکدا قەرەقۆز بەچرپەوە لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام

بوو. سەرەتا باسی بڕە پارەیەکی زۆری کرد کە پێویستە ئەو خێزانە بە حکومەتی بدات. کە پیرەمێردەکە گوێی لەو بڕە پارەیە بوو چاوی ڕەشکەو پێشکەی کردو، دنیای لەبەرچاو تاریك داهات و قۆڕگی گیرا، قەرەقۆزیش تا دەهات بەرەو لای دیوارەکە پاڵەپەستۆی دەختە سەر.

- هیچ نییە. هەر هەموو ئەمە هیچ نییە. بێگومان زیانەکە زۆرترە. لەم بڕە پارەیە زۆرترە، ئەمەیش چارەکێك لە سامان و دارایی گوێزراوەتانە. جا لەبەر ئەوەی ئێوە بەردەوام زانیاری نادروست لەبارەی موڵکەکانتانەوە دەبێژن و، لێدوان سەبارەت تەنیا چارەکی موڵکەکانتان دەدەن کە لە ڕاستیدا هەتانە، بۆیە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوە بەشێکە لە شازدە بەش. ئامۆژگارییەکانی من لە گوێ بگرەو پارەکە بدە. ڕەنگە بەمەیش کارەکە هێور ببێتەوە. بەڵام ئەگەر پارەکە نەدەیت....

ئەو کات قەرەقۆز هەموو پلانە ئیبلیسیانەکەی خۆی خستە بەردم ئەم بازرگانە کە بە چاوی نووقاوو، بە ئاستەم هەناسەی دەدا.

لەم ڕۆژانەی دواییدا لە ماڵی چەند ئەرمەنییەکدا دوو ڕووداوی نەخۆشی سەریان هەڵدا وایان زانی چاوەقووڵەیە. ئەوەندەی نەمابوو بەرپرسان ئاگەدار بکرێنەوە تا هەموویان بە گەورەو بچووکەوە دەستبەسەر بکرێن و، لە نەخۆشخانەی ئەرمەنی بۆ نەخۆشی و درم و پەتا بپەستێنرێن، لەوێش درمەکە تووشی نزیکەی نیوەیان دەبێت و، بێگومان دەمرن. دەشبێت لەو کاتەدا خەڵکانێك لە دەرەوە یان خزمەتکارو کارەکەرەکان دەچنە ناو ئەو ماڵ و دووکانە چۆڵانەوەو، ئەو شتانەیان تێدایە دەدزن چ لەبەر چاو بن یان شارابنەوە. پاش ئەوەیش ئۆرە دێتە سەر ئەوەی کە بە شێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ تووشبووان و ماڵ و موڵکەکانیاندا دەکرێت. لەکاتێکدا لەو بارەوە دەدوا قەرەقۆز پاڵەپەستۆی زۆرتری بەرەو لای دیوارەکە دەخستە سەر ئەرمەنییە بێ هۆشەکە، ئەرمەنییەکەیش دەیویست شتێك بڵێت، شتێك لە قورگیەوە بدرکێنێت، لە کاتێکدا هەردوو چاوی لەناو کاسەی چاویدا دەخولاندەوەو، داوای مۆڵەتێکی کورت و شوێنێکی بچووکی دەکرد بیری تێدا بکاتەوەو لەگەڵ خزم و کەس و کارەکانیدا ڕێك بکەوێت. بەڵام

قەرەقۆز نە ڕێی ئەمەو نە ڕێی ئەوەی پێ نەدەدا، لەکاتێکدا بە چرپەیەکی ناقۆڵاوە ئەوەی بە گوێیدا دووبارە دەکردەوە کە دەبێت هەموو شتێك ئێستە، لەم ساتەو لەسەر ئەم تەختە چارەسەر بکرێت.

زۆربەی بەندییەکان ئەوانەی بەردەوام لەبەرانبەر قەرەقۆزدا بۆ ژوورەکانیان یان بۆ دوورترین گۆشەی گۆڕەپانەکە دەکشانەوە نەیانتوان هیچ شتێك لەو ڕووداوە ببیستن یان ببینن. بەڵام لەوە دڵنیا بوون کە ئەوەی لە نێوان قەرەقۆزو گریگۆری پیرەمێرددایە کێشەیەکی دژوارەو لەو قۆرتی دیوارەدا یەکلا دەکرێتەوە. پاش چاوەڕێ کردنێکی دوورو درێژ بەڕێوەبەریان بینی بەرەو نووسینگەی چاودێر دەچوو کە دەکەوێتە سەرەوەی دەروازەی سەرەکییەوە، گریگۆریش بە نقە نق هەڵدەستێت و بەردەبێتەوەو، دواتر لەسەر پێ ڕادەوەستێت، وەك بڵێیت لەوپەڕی بێ هۆشیدا بێت، کاتێك بەرەو ئەو ژوورە دەچوو کە خزم و کەس و کارەکانی تێدا بەندکراون. لەوێ دەنگی ناکۆکی و دەمەقاڵێی ئەوتۆو بەرەنگاربوونەوەی بێ هوودەی ئەندامە لاوەکانی ئەو خێزانە بەر گوێ دەکەوت. پاشان کپی و بێ دەنگی باڵی بەسەریاندا کێشا. گریگۆری پیرەمێرد دوو لە کوڕە لاوەکانی بن هەردوو باڵیان گرتبوو بەرەو ژووری چاودێریان دەبرد، تا لەگەڵ قەرەقۆزدا لەسەر چۆنیەتی پارەدانەکە ڕێك بکەوێت.

لەماوەی چەند ڕۆژێکدا هەموویان ئازاد کران، ئەویش هەر جارەی دوو یان سێ پیاو پێکەوە ئازاد دەکران. چەند هەفتەیەکی دواتر لە گۆڕەپانەکەدا لەو بارەوە قسەیان دەکردو، چۆن قەرەقۆز توانی پارەیەکی زۆر لە گریگۆری بڕووتێنێتەوە. خەڵك بەسەرهاتەکەیان بە وردەکارییەکانیەوە دووبارە کردەوە، بەو وردەکاریانەوە کە کەس نەیدەزانی تەنیا هەردووکیان نەبێت، کە گێراوەکان بە شێوەیەکی سەیر ئاگەداری بووبوون یان بە خۆیان ڕازاندبوویانەوە.

زۆر جار قەشە پیتەر بە هەستێکی تێکەڵ بە ژان و تووڕەیی و، بە جۆرە سەرسوڕمانێکی ناهەستییەوە لە بارەی قەرەقۆزەوە دەپەیڤی. بەسەرسوڕمانێك کە بە خۆیشی نهێنییەکەی نەدەزانی، بەڵام بە ئارەزوویەکی پێویستەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەو

مرۆڤە تۆقێنەرە بە ڕەوانترین وشە بکێشێت، تا لای گوێگر ڕوون و ئاشکرا بێت، زۆر جار بە چەند وشەیەکی گاڵتەجاڕیش بووایە دەگەڕایەوە لای و هەستی دەکرد کە قەرەقۆز هێشتە کۆتایی نەهاتووە.

بەو چوست و چالاکی و بە هەمان وردەکاریشەوە سەبارەت بە ژیانی هەر هەموو گۆڕەپانەکە دووا، هەروەها سەبارەت چەند کەسانێکی قسەخۆش و پێکەنیناوی دووا لەو نەخۆشانەی ناو گۆڕەپانەکە کە جێی داخ و پەژارە بوون و لە کەسانی دیکە لێوەی نزیکتر بوون و دەیناسین، زۆرتر لە تاوانبارو پیاوکوژو شەڕخوازە سووك و هیچ و پووچەکان کە تا بۆی بکرایە خۆی لێ دوور دەگرتن.

هەرچۆنێك بێت وا پێدەچێت هەموو ئەوانە گرنگ نەبن و، بەشێکی گرنگی ئەندێشەی قەشە پیتەریان لە بارەی گۆڕەپانە نەفرەتییەکەوە نەگرتبێتەوە، کە زۆر جار لە دوا ڕۆژانی ژیانیدا لە بارەیەوە بۆ ئەو لاوانە دەدوا لە تەنیشتییەوە دادەنیشتن.

# دووەمین پار

وەك چۆن لە کاتی هەموو نەگبەتی و خراپەکارییەکدا ڕوو دەدات، بەو جۆرە ڕۆژگاری سەرەتا لە گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا دژوارو نالەبار بوو، بە تایبەتی شەوانە کە کەس بەرگەی نەدەگرت. بۆ ئەوەی قەشە پیتەر تا بۆی بکرێت خۆی لەو دیمەنە قێزەونانەی ئەو شەوانە بپارێزێت، گۆشەیەکی دووری ژوورە گەورەکەی بەندیخانەکەی هەڵبژارد، کە لەو دیوی دووکەڵدانە وێرانە گەورەکەوە بوو. لەوێ لەگەڵ ئەو چەند پێداویستییە کەمەی لەگەڵ خۆی هەڵیگرتبوون خۆی گۆشەگیر کردبوو. لەوێ بەر لەوەی ئەو بێت دوو پیاوی بولگاری هەبوون کە ئەوانیش (ڕێبوار) بوون، بۆ ئەوە ئامادە کرابوون بۆ (مەنفا) دوور بخرێنەوە. بە گەرمی پێشوازییان لە قەشە پیتەر کرد، ئەگەرچی بەچەند وشەیەکی کورتیش بوو. بێگومان زۆریان پێ خۆش بوو پیاوێکی هێوری وەك ئەو ئەم شوێنە بگرێتەوە، بە جل و بەرگی سڤیلەوە، لە بۆسنیاوە هاتبێت کە هیچ شتێکی دەربارە نازانن، پرسیاریان نەکرد، بەڵکو مەزەندەیان کرد کە ئەم (ڕێبوارە)، وەك ئەوان لەم جەنجاڵییە نالەبارو ترسناکەدا دووچاری دەستکورتی بووە.

وەك تێبینی دەکرێت هەردووکیان دوو پیاوی زەنگین بوون. بۆیە ـ بە ڕادەی ئەوەی توانی تێبگات ـ قوربانیی ئەو شۆڕشە بوون لە وڵاتی ئەوان بەهۆی باجی گران و بەرتیل و شێوازی چاوەڕوان نەکراوی کۆکردنەوەیان بەرپا بووبوو. وایش هاتنە پێش چاو کە لە جۆرە بارمتەیەك دەچوون. هەرگیز باسی تاوانەکەی خۆیان نەدەکرد. دوو پیاوی دلێرو ترساو بوون ئەگەرچی ئەوەیان بە ڕوخسارەوە دیار نەبوو. نە ترس و نە هیچ شتێکی دیکە. هەموو ئەوەی لەسەریان بوو، لە ناخیاندا بوو خۆگیرو هوشیاربوون. بەردەوام پشتوێنیان بەستبوو، جلیان پۆشیبوو، پێڵاویان لەپێ بوو، بۆ ئەوەی لە ناکاو پێیان نەگوترێت دەی بڕۆین و ئەوان ئامادە نەبن.

لەکاتێکدا بەندکراوەکانی خەلکی شاری ئەستەنبوولّ بە گەورەو بچووکیانەوە لەو بڕوایەدا بوون کە گۆڕەپانە نەفرەتییەکە بەشێکی ژیانیانەو، بەو شێوەیش هەلّس و کەوتیان دەکرد، بەلاّم ئەو دوو پیاوە لە زیندووان نەدەچوون بەلکو تەنیا لێرە نیشتەجێ بوون و، ددانیان بەخۆدا گرتبوو. ژیانیان لەوێ بوو لە بولگاریا، ئەوان هەنووکە چاوەڕێن بڕیاری دادگە دەربچێت، بۆیە بە شێوەیەکی دوور لە مالّ و خێزانەکانیان دەیانگوزەراند، ـ ئەگەر لەچارەیان نووسرابێت و بگەڕێنەوە ـ وەك بلّێیت هەر نەژیابن و ژیان پێویست نەبێت. ژیانی هەموو (ڕێبوارەکان) بەم جۆرە بوو. یەکێکیان لە ژوورەکە بۆ ساتێك دەچووە دەردوە، ئەمەیش بە دەگمەن بۆ ساتێك ڕووی دەدا، لەکاتێکدا ئەوەکەی دیکەیان لەسەر حەسیرەکە نزیك بە شت و مەکەکان دادەنیشت. بەوە ڕاهاتبوون کە بێ دەنگ و بێ جوولّە دادەنیشتن یان پالّ دەکەوتن. ئەگەر پێویست نەبووایە چاویشیان هەلّنەدەبڕی. بە دزییەوە شتێکی کەمیان دەخواردو، تەنیا ئاویان دەخواردەوە. لەو کاتەیشدا بە لایەکدا وەردەچەرخان. لەگەلّ کەس قسەیان نەدەکرد. زۆریان سەر لەوە سوڕماو زۆریان پێ ناخۆش بوو کە قەشە پیتەر لە گۆڕەپانەکەدا بەشداری قسەو گالّتەی لەگەلّ بەندکراوەکاندا دەکرد، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی قسە لەگەلّ گومان لێکراوێکدا بکات. داوایان لە قەشە پیتەر کرد بە تاریکی جگەرە نەکێشێت چونکە ئەو کارە میوانی ڕەزا قورسیان بۆ دەهێنێت.

هەرچۆنێك بێت پاش چەند ڕۆژێك پێشوازییان لە میوانێك کرد، ئەوەندەی نەبرد بوو بە دراوسێ. کەسانی دیکەیش هەبوون ئەو گۆشەیە ڕایکێشان کە (ڕێبواران)ی هێورو گۆشەگیرو تۆقیوی لێ دادەنیشن.

دواتر، کاتێك قەشە پیتەر چەندین جار بیری لێ کردەوە، ئەوە نەیتوانی بەتەواوەتی ئەوەی بیر بکەوێتەوە کە ئەو پیاوە کەی هات و، ئەیش چۆن هات، کاتێك بە دوای شوێنێکی بچووکدا دەگەڕا، ئەیش ئەو کاتە چی گوت ـ چونکە لای ئەوکەسانەی نزیکمان دەبنەوە زۆر جار وردەکارییەکانی ڕووداوی سەرەتامان لە یاد دەچێتەوە. وا مەزەندە دەکەین هەر لە مێژە دەیانناسین، یان هەر لە دێر کاتەوە لەگەلّمان بوونە. لەهەر هەموو ئەو شتانەیش یادوەری هیچ شتێکی بیر نایەتەوە تەنیا چەند وێنەیەکی پچڕ پچڕ نەبێت ـ.

لــە یەکـەمین سـاتەکانی ڕۆژئـاوا بوونـدا، سـێبەرێکی درێـژی پیاوێـك بەسـەریاندا نووشتایەوە گەنج دەهاتە پیش چاو. یاتاغەکەی بە دەستێکیەوە بوو، بەو دەستەکەیشی جانتایـەکی لـە پێست دروسـت کـراوی پـێ بـوو. هـەردوو بولگارییەکـە سـەرەتا چـەند سەرجێکی خێرای چەوت و چەوێلیان لە نێوان خۆیاندا ئالوگۆڕ کرد، پاشان لەگـەڵ قەشـە پیتەردا. بە ڕوخساریانەوە دیاربوو کە پێیان ناخۆشە.

ئەوەی هاتبوو تورك بوو! بێ هیچ جم و جووڵ و خۆماندوو کردنێك شوێنی بـۆ خـۆی کردەوە، تەنانەت دەنگی هەناسەی نەدەبیسـترا. کاتێك ئەو شەوە ئاگەدار دەبووەوە (کەس نییە لێرە شەوی چەند جار لە ناو خەودا ئاگەدار نەبێتەوە)، قەشـە پیتـەر هەسـتی بـەوە دەکرد کە ئەو کابرا (تازە)یە ڕاکشاوەی تەنیشتی نانوێت. کاتێك قەشە ئاگـەدار بـووەوە بەرەبەیان بوو، لە بەر ڕووناکی کزی بەرەبەیاندا ـ کە بێگومان لە دەرەوە ڕوونـاکترە ـ بـە تیلەی چاو تەماشای لای ڕاستی کرد، بۆ ئەو شوێنەی تورکەکەی لێ نووستبوو کە شەوی ڕابوردوو هات. یەکەمین شت کە بینی کتیبێك بوو گـەورە نـەبوو، بـەرگێکی زەردی تـێ گیرابـوو. هەسـتی زۆری بـە شـادومانییەك کـرد کـە هـەموو جەسـتەی تەنییـەوە. ئـەوە بەشێکی ئەو جیهانە مرۆییە ڕاستەقینە بزرەیـە کـە لـەو دیـوی دیوارەکانـەوە بـە دووری ماوەتەوە، شتێکی جوانە بەڵام بە دیتن دووپات نەکراوەتەوە.. تیلەی چاوی دایە کتێبەکە لە شوێنی خۆیدا مابووەوە، بە ڕاستی کتێب بوو. کاتێك دوورتر ڕوانی کتێبەکـەی بینـی لە ئامێزی پیاوێکدایە لە بارێکی نیوچە ڕاکشاوو دانیشتندا بوو، پـاڵی بـە سـنووقێکەوە دابوو کە شەوی ڕابوردوو لەگەڵ خۆی هێنابوو، جانتایەکی گەشتوەری لە پێـست دروسـت کراوی لە تەنیشتەوە بوو ڕەنگێکی واڵای هەبوو، بە لێفەیەکی تاریـك و بریقـەدار خـۆی داپۆشیبوو، بۆ بینەری دووپات دەکـردەوە کـە خۆشـنوودییەکی فێنکـی وەك فەروویـەکی بەهادار دەخستە دەروونەوە. قەشە پیتەر بیری لە نرخ و بەهاو شێوەی ئەم شتانەی دەورو بەری نەدەکردەوە، لەبەرە ئەوەی نژادو پەروەردەو و پێداویستییە کەمەکانی پاڵیـان پێـوە نەدەنا بیر لەوە بکاتەوەو، بایەخی بەو جۆرە شـتانە نـەدەدا. لەگـەڵ ئەوەیـشدا نـەیتوانی تەماشای ئەو شتانە نەکات کە ئێستە تەماشای کردن. چونکە بـە درێـژایی ژیـانی شـتی

ناسایی نەبینیوە بۆ کاری ڕۆژانە بەکار بێن، بەم شێوە پسپۆڕییەو لەم جۆرە کەرەستە باشانە دروست کرابن. ئەگەر لە بۆسنیا بمایەتەوە، بۆ بەدبەختی لەم گۆڕەپانە توند نەکرایە، ئەوە نەیدەزانی و بڕوای نەدەکرد شتی لەو جۆرە هەیە.

دوورتر ڕوانی، دەم و چاوی پیاوەکەی بینی شتێکی سەرسوڕماوی دیکە بوو. دەم و چاوی لاوێك بوو لە هەرەتی لاویدا، کەمێك ئاوساو بوو، سپی دەچووەوە، وەك ڕەنگی ژوورەکە زەرد هەڵگەڕابوو. کە پێچەوانەی هەموو ئەو شتانە بوو کە لێرە پێشبینی دەکرا، چەناگەو ڕیشێکی مەیلەو زەردی هەبوو دە ڕۆژ بوو نەتاشرابوو، لەگەڵ دوو سمێڵی فشی زەردی کاڵ. چەند بازنەیەکی گەورەی نەخۆشی تاریك بە دەم و چاویەوە بوو، دوو چاوی شین هەڵگەڕاو لە نێوان شێ و ئاگردا بریسکەیان دەهات. قەشە پیتەر ئەوەی لا زۆر ڕوون بووەوە، ئەوێك لە ژیانیدا چەندین نەخۆشی بینیوە لە هەموو جۆرە نەخۆشییەك. بە تەواوەتی ئەو دوو چاوەی نەبینیبوو بەڵکو ئەوانەی لەو دوو چاوە دەچن.

کەسانێك هەن لە شتێك دەترسن و، شەرمی لێ دەکەن، ئارەزوو دەکەن بیشارنەوە، لەبەر ئەم هۆیەشە دەیانەوێت بە ڕوانینی خۆیان سەرنجی کەسانی دیکە بە لای خۆیاندا ڕاکێشن، لە هەوڵ و ئارەزوویەکدا بۆ سنووردارکردنی ئەو ڕوانینانەو، ڕێ پێنەدانیان تا دوور تر نەڕۆن و هێڵ و نیشانەو هیماکانی دەم و چاو یان بەشێك لە جەستەیان یان جل و بەرگیان وردت نەپشکنن. لاوەکە بە هەردوو سمێڵە ڕەشەکەی و، هەردوو چاوە هەنگوێناوییە لێکەوە دوورەکانی و ڕوانینە هێورانەکەیەوە بە پشووەوە تەماشایەکی وردبینانەی دەم و چاوی پان و پڕو واڵای قەشە پیتەری کرد.

قسەکردن لە نێوانیاندا لەخۆوە دەستی پێکرد، ئەمەیش باشترین جۆری قسەکردنە، سەرەتا بە جۆرە سڵاو لێك کردنێك، بەچەند وشەیەکی کەم، کە بە دواییاندا دەگەڕاو، لێی ورد دەبوونەوە لە دەستپێشخەرییەکدا بۆ لێك نزیکبوونەوە. ئەمەیش بەلای قەشە پیتەرەوە بەس بوو بۆ ئەوەی لەوە دڵنیا بێت کە ئەو تورکە سەرپێچ و بێزراو نییە وەك مەزەندە دەکرێت، ڕاستە گۆشەگیرە، بەڵام بە شێوازێکی دیکە.

بەم شێوەیە بەیەك گەیشتن و تا نیوەڕۆیش چەند جارێك لێك دابڕان. هەر جارەیش چەند وشەیەکیان ئاڵوگۆڕ دەکرد کە گرنگ نەبوون. قسەکردن و پەیڤینی ناو بەندیخانان بەم جۆرەیە، بە سست و خۆگیرییەوە دەست پێ دەکەن و، دواتر و لەبەر نەبوونی زادی نوێ، ئەوەندە نابات بە ئاسانی و بێ دەنگییەکی گومانـاوی کۆتـایی دێـن، تێیدا هەر یەکـە هـەموو ئـەوەی هاوەڵەکەی گوتوویەتی و هەموو ئەوەی گوێی لێ بووەو بیستوونی تاقی دەکاتەوە.

لە ماوەی نانی نیوەڕۆدا هەر یەکە ئەوی دیکەی لە بـوار ڕوانینـی خـۆی بـزر کـردو، دوای نیوەڕۆ درێژەیان بە پەیڤینەکانیان دا. تا لەوە دڵنیـا بـوون کـە هـەر یەکـەیان بـاش دەتوانێت شت بە ئیتالی بخوێنێتەوە. بەو زمانە هەندێك وشەیان ئاڵوگۆڕ کرد وەك بڵێیت یاری دەکەن. بەڵام ئەوە هەرچۆنێك بێت لەکەسانی دیکەی دەوروبەریان دووری خستنەوەو پتر لێکی نزیك خستنەوە. سەبارەت شاری جۆراوجۆرو شوێنی جیاجیـای جیهـان قـسەیان کـرد، پاشـان دەربـارەی کتێـب. بـەڵام لەبـەر ئـەوەی هـەردووکیان هـەمان کتێبانیـان نەخوێندبووەوە بۆیە پەیڤینەکەیان کەمێك گرێ و گـۆڵی تێکـەوت. نـاوی خۆیـان گـوت. لاوەکە ناوی (جەمیل) بوو، قەشە پیتەر ناوی خۆی گـوت و نازناوەکـەی شـاردەوە، هـیچ کامیان یەك وشەیش چییە لـەبارەی خۆیانـەوە یـان ئـەو هۆیـەوە کـە هێنابوونییـە ئێـرە نەدرکاند. هەر هەموو ئەوە لـە سـنووری بازنـەی داخـراوی پـەراوێزی ژیانـەوە بـوو. لاوە تورکەکـە پـتر بـە تەنگـەوە بـوو، بـە دەنگـە قـووڵ و ڕەسـەنکەی و بـە سـەر لەقانـەوە لەسەرخۆکەی دووپاتی هەموو ئەوەی دەکردەوە کە قەشە پیتەر دەیگوت. بێ بیرکردنـەوە هەموو شتێکی دووپات دەکردەوە، لەو پەیڤینەیش دەستی پێ کردبوو هـیچ بیرۆکەیـەکی تەواو نەکردبوو، تەنانەت ئاسـاییەکانیش. زۆر جـار لـە ناوەڕاسـتی ڕسـتەدا ڕادەوەسـتا، بەردەوام بە تیلەی چاو بۆ دووری دەڕوانـی. پەیڤینەکـەی قەشـە پیتـەر چـالاکانەتر بـوو، ئەویش لەبەر ئەوەی بە دیداری ئەم هاوەڵەی شاد بوو، بەڵام ئەوەندەی نەبرد لەگەڵ خۆیدا ئەوەی گوت: بێگومان من لەگەڵ کابرایەکی نەخۆشدا دەدوێم.

پێویستی نەدەکرد خەڵکی تا ئەو ڕادەیە بناسێت کە ئاسیونی بۆ ئەوەی ئەم ئاکامـە بەدەست بهێنێت.

ـ بەڵێ. بەڵێ ـ تورکە لاوەکە بەشێوەیەکی سەیری ئەوتۆ ئەوەی دەگوت ڕێزگرتنی تەواوی پێوە دیار نەبوو. بەڵام ئەم (بەڵێ. بەڵێ)یە خودی هزرەکانی قەشە پیتەریان لەبارەیەوە دووپات دەکردەوە.

ئەو پەیڤینانە هەر جۆرێك بووبان و، چۆن هەڵکەوتبان، وەك بڵێیت پەیڤینی شادومانانەن بۆ هەردوو بەندکراوەکە، وەك بەخششێکی پێشبینی نەکراو زۆریان بەلاوە خۆشەویست بوون، چونکە شتێکی زۆر دەگمەن بوون لێرە. بۆیە دووبارەیان دەکردەوەو دوای هەموو دابڕانێك درێژەیان پێ دەدا.

هەردوو بازرگانە بولگارییەکە بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە، بەڵکو بە گومانێکی پەردەپۆش کراو پتر لەوەی سەرسوڕمان بێت، تێیان دەڕوانین. کاتێك تاریکایی دادەهات، قەشە پیتەرو لاوە تورکەکە پێکەوە شیوی ئێوارەیان دەخوارد. ڕاستتر قەشە پیتەر بە تەنیا شیوی دەخوارد چونکە لاوەکە هیچی نەدەخوارد، بەڵکو ئەبڵەقاوی پارووەکەی دەرەنگ دەجوو. قەشە پیتەریش بە ڕاشکاوی پێی دەگوت:

ـ جەمیل ئەفەندی، لێم مەگرە، بەڵام ئەم نان نەخواردنەت زیانت پێ دەگەیەنێت.

بۆی دووپات دەکردەوە کە ئەگەر مرۆڤ تووشی هەر مەینەتییەك بێت وای لێ پێویست دەکات پتر ڕوو لە نان خواردن بکات تا بەهێزتر بێت و ڕووگەشتر بێت پتر لەوەی لە بارێکی کامەرانیدا بێت.

ـ بەڵێ. بەڵێ.

لاوەکە وەڵامی دەدایەوە، بەڵام دواتر خواردنی ئەوتۆی نەدەخوارد.

ڕۆژانی دواتر دەمەتەقێی نێوانیان بەردەوام بوو. دەمەتەقێیەکی دوورو درێژ بوو، پتر خۆڕسکانەو زیندووانە بوو. کات بەشێوەیەکی جوانترو خێراتر تا ئێوارە بەسەر دەچوو. لەگەڵ داهاتنی سەرەتای تاریکیدا دەمەتەقێکە سستترو کەمتر دەبووەوە. تەنیا قەشە پیتەر قسەی دەکرد. تەنانەت ئەو بەڵێ بەڵێ وێڵە، هەندێك جار نەدەگوترا، چونکە تا دەهات لاوەکە بەرەو ناخی خۆی دەکشایەوە، بە بەرزکرنەوەی هەردوو پێڵووە قورسەکەی داگرتنیانەوە دووپاتی هەموو ئەوەی دەکردەوە کە بیستبوونی بێ ئەوەی بە ڕاستی بەشداری لە دەمەتەقێکەدا بکات.

لەو ڕەنگە ئەرخەوانییەی کە بە ڕووی ئاسمان و سەری ئەو پەیکەرە کەمانەوە دروست دەبوو کە لە دەرەوەی شوورە بەرزەکەوە بوون، دەیانزانی کە هەتاو خێرا لە شوێنێك لەوپەڕی شارە گەورەکەوە ئاوا بووە. لەکاتێکدا گۆڕەپانەکە پڕ لە بەریەرچدانەوەیەکی سوور دەبوو خێرا وەك دەفرێکی هەڵەوگێڕاو بەتاڵ دەبووەوە، ئەو کات تاریکایی نێوارە بە سستی و لەسەرخۆ دادەهات.

پاسەوانەکان بەندکراوەکانیان ڕەوانەی ناو ژوورەکانیان کردەوە، تەنانەت وەك گەلەیەکی پەرت و بڵاو هاتنە پێش چاو کە بە گوێیان نەدەکردن. لەبەردەمیان هەڵدەهاتن، لە شوێنە دوورەکانی گۆڕەپانەکەدا خۆیان حەشار دەدا چونکە کەسیان نەیدەویست ڕۆژ بەڕێ بکات و بچێتە ناو ژووری تەسك و تروسکەوە. دەنگی لێدان و هاواریش بەرگوێ دەکەوت.

لەو ساتەدا پاسەوانێك بەرەو ئەو ژوورە ڕای کرد کە هێشتە قەشە پیتەرو لاوەکەی لەبەردەمدا دانیشتبوو، بانگی ناوی لاوەکەی کرد، لە نزیك ئەویشەوە پاسەوانێکی دیکە ڕای کردو بانگی هەمان ناوی کرد، بەڵام بە دەنگی بەرزتر. وەك چۆن لەم جۆرە شوێنانەدا باوە، ئەوە هاواری کورتتر دەبێت هەرکە فەرمانێکی توندی لە پشتەوە بێت لە سەرەوە هاتبێت، خێراتر دەبێت چ بە خراپ یان بە چاکە بێت، ئەوەیش پێوەندی بە ناوەرۆکی فەرمانەکەوە هەیە. لەم بارەدا گریمانەی ئەوە دەکرا ئەو هاوارە پۆزەتیڤانە بێت. هەردووکیان بە نەرمییەوە داوایان لە لاوەکە کرد دەست بەجێ بچێتە ژوورێکی دیکەوە بۆی دیاری کراوە، یارمەتییان دا شت و مەکەوکانی کۆ بکاتەوە، ئەوەیش نیشانەی ئەوەبوو کە بۆ شوێنێکی باشتر دەچێت.

لاوەکە ئەم چاودێرییە پێشبینی نەکراوەی وەك فەرمان پێگەیشت، بەبێ سەرسوڕمان یان پرسیار کردن. بەر لەوەی هەنگاو بنێت ئاوڕی بە لای هاوەڵەکەی ژوورەکەیدا دایەوە وەك بڵێیت بۆ یەکەمین جار شتێکی ئاشکراو ڕوونی پێ ڕابگەیەنێت، بەڵام تەنیا بزەیەکی هاتێ و، سەری لەقاندەوە وەك ئەوەی لە دوورەوە سڵاوی لێ بکات.

بەم شێوەیە بێ هیچ وشەیەك، وەك دوو هاوڕێی باش و گیانی بە گیانی ماڵئاواییان لە یەکدی کرد.

ئەو شەوە قەشە پیتەر زۆری بیر لە تورکە سەیرەکە کردەوە. بە ڕاستی تورك بوو تورکیش نەبوو. بێگومان کابرایەکی بەدبەختە، کاتێك دەچووە ناو خەیاڵ و ئەندێشەوە کە خەوەنووتکە دەیبردەوە وای دەزانی هێشتە لە تەنیشتییەوەیەو وشیارە، بەڵام لەگەڵ کتێبەکەی و شتە جوانەکانیدا بە شێوەیەکی نائاسایی هێورو نارامە. لەهەمان کاتدا بە ڕوونی هەستی بەوە دەکرد کە ڕۆیشتووەو، بەڕاستی لێرە نەماوە، بۆیە هەستی بەوپەڕی داخ و پەژارە دەکرد. کاتێك توانی بە ڕاستی خەوی لێ بکەوێت - ئەگەر خەوتنەکەیشی بەردەوام بوایە ئەوە قووڵ و قورس دەبوو، بەردەوام نە خەونی تێدا دەبینی و نەیش ئاگەی لە خۆی و نە جیهانی دەورو بەری دەما - ئەوەی تەنیشتی کە لە لای ڕاستییەوە دەنووست خەو بردییەوە پاش ئەوەی زۆری بیر لێ کردەوە. بەڵام کاتێك شەوانە بە ئاگە دەهاتەوە جۆرە هەستێکی دوورو تەم و مژاوی، بەڵام زیندووانەو، داخێکی زۆر دایدەگرت بۆ سەردەمی لاویەتی دەبردەوە کاتێك ناچار دەبوو لە هاوەڵە باشەکانی دوور بکەوێتەوە تا لەگەڵ جیهانی نەناسراوەکاندا بمێنێتەوە کە گوێ بە هیچ نادەن و، ناچار - بەپێی کارەکەی - لەگەڵیاندا بژێت و کار بکات.

هەرکە ڕۆژ بووەوە ئەو خەونە شەپۆلدارو ئەو ئەندێشانە ڕاوەستان.

هیچ شتێك بە ڕووی سپی ڕۆژەوە نەما تەنیا ڕاستی ڕووت نەبێت: دراوسێکە لێرە نەماوە. شوێنەکەی بەتاڵە. لای ڕاستەوە هەستی بە ناخۆشی و، خەفەتی ئەم ژیانە پڕ لە ئازارو ئەشکەنجەی گەورەو بچووك و، پەژارەی جۆراوجۆرە کرد، لای چەپیشەوە هەردوو بازرگانە بوڵگارییە بەردەوام بێ دەنگەکە دەبینێت کە بەردەوام ئامادەن بە ڕێ بکەون.

هەرکە لەگەڵ لاوەکەدا لێك دابڕان ئەوەندەی نەبرد شوێنەکەی گیرا. پیاوێکی لاوازی باریکەلەی ڕیش نەتاشراوی پەرپووت و قژ لوول و ڕەش. زۆر جار داوای لێبووردنی کرد لەکاتێکدا زۆرو خێرا قسەی دەکرد. گوتی نایەوێت بارگرانی بۆ هیچ کەسێك هەبێت، بەڵام هاوکاتیش ناتەوانێت چاوپۆشی لە کەم ئابڕوویی ئەو کەسانە بکات کە تا هەنووکە

لە نێوانیاندا نوستووە، بۆیە ناچار بوو بە دوای شوێنێکی هێورتردا بگەڕێت لە نێوان خەڵکانێکی باشتردا. سەبەتەکەی کە لە پووشێکی لوولدراو دروست کرابوو لەگەڵ هەندێك کۆنە جل و بەرگدا داگرت و، درێژەی بە قسەکردن دا. لێرە وا باو نەبوو مرۆڤ بەر لە پێشەکی فەرمیانە دەست بە قسەکردن بکات. بەڵام ئەم پیاوە یەکسەر سەبارەت بە هەموو شتێك قسەی دەکرد وەك بڵێیت لە نێو خزم و کەس و کارە دێرین و بڕوا پێکراوەکانیدایە. تێبینی ئەوەیش کرا کە لە پێناوی خۆیدا دەدوا پتر لەوەی لەبارەی ئەو بابەتەوە بدوێت کە ئارەزوو دەکات باسی بکات، یان بۆ ئەوانەی قسەیان بۆ دەکات، مادامەکێ بە شێوازێکی دیکە ئەو کارە نەکەردەنییە.

هەردوو بازرگانەکە زۆرتر گۆشەگیر بوون و چوونە قاوغی خۆیانەوەو، پتر لە تەنیشت یەکدییەوە هەڵترووشکان. قەشە پیتەر بەردەوام گوێی ڕادێرابوو، لەو پیاوە نائاساییەی ڕادەما، تا ڕادەیەك وا دەهاتە پێش چاو بەو شکۆیەوە هانی زۆر بڵێی ئەو بدات. بیری کردەوە: چەند لە قەشە ڕافی هاوڕێم دەچم، کە دەیتوانی گوێ لە هەموو کەسێك بگرێت و کاری تێنەکرێت. بە گاڵتەوە دەیگوت: (دەتوانم بەبێ نان بگوزەرێنم بەڵام ناتوانم بێ دەمەتەقێ بژیم). ئەو پیاوەی تازە هاتبوو هەر قسەی دەکرد.

جوویەکی خەڵکی سمیرنا بوو. غەم و پەژارە بە ڕوخساری گەنم ڕەنگییەوە دیاربوو، بە لووتێکی گەورەو دووچاوی زەقی سپێنەی زەردی خوێناوی. هەر هەمووی غەمبارو بە خەفەت و ترساو دەهاتە پێش چاو. بەڵام پێویستی بە قسەکردنی زۆر گەورەترو بەهێزتر بوو لە گیروگرفت و ترسە گەورەکەی. وا دەهاتە پێش چاو درێژە بەو دەمەتەقێیەی دەدات کە شەوی ڕابوردوو لەگەڵ قەشە پیتەردا دەستی پێکردبوو ـ ئەو کاتەی پێکەوە لە ژوورەکەوە چوونە گۆڕەپانەکەوە، بە چوست و چالاکی و دەنگێك لە چرپەوە نزیك بوو ـ لەبارەی خۆی و کێشەکانییەوە قسەی بۆ دەکرد.

ـ وێڕای ئەوەی دزیت لێ دەکرێت، کەچی تاوانبارت دەکەن بەندیشت دەکەن، تکاتان لێدەکەم چۆن دەبێت ئێمە لێرە لەگەڵ ئەم ناکەس بەچانە بین؟ من دەپرسم !

دەستی بە ژماردنی هەر هەموو ئەو پرسیارانە کرد کە ئاراستەیان کردبوو. پرسیاریان لەبارەی هەموو شتێکەوە لێ دەکرد. ئەگەرچی بەترسەوە تەماشای ئەم لاو ئەو لای خۆی دەکرد، بەڵام لەقسەکردن نەدەکەوت. (زۆر بلێییەکەی بۆ ئێرەی هێنابوو). قەشە پیتەر بیری لەمە دەکردەوە، لە کاتێکدا بە یەك گوێ گوێی لێ ڕادێرابوو. زۆر بلێییەکی ئالەبارو شەکەتبار بوو لە زاری ئەم پیاوە سەیرەوە دەهاتە دەرێ کاتێك ناوی جەمیل ئەفەندی هێنا.

ـ دوێنێم بینی پەنای بۆ لای ئێوە هێنابوو، ئێوەی کەسانێکی بەڕێز. ئێستە ژوورێکیان لەو شوێنە پێداوە کە ناوی ڤێللا سپییەکەیە، لەوێ لای دەروازەی سەرەکی، نزیك بە شوێنی نووستنی پاسەوان و کارگێڕەکان، لەوێ کە ژووری تەنیای تایبەت و، خواردنی تایبەت بۆ بەندکراوانی بەڕێز هەیە. بەڕاستی کارێکی ناڕەوایە: مرۆڤێکی وەك ئەو لەو شوێنەدایە!؟

قەشە پیتەر ڕاچڵەکی:

ئێوە جەمیل ئەفەندی... دەناسن؟

ـ من ؟ چۆن نا! من ناتانناسم، ببوورن، ئێمە... لەپڕ بەیەك گەیشتین.. ناتانناسم، بەڵام دەبینم کە بەڕێزتان پیاوێکی شکۆدارو ڕێك و پێکن، ئەمەیش بۆ من... نا.. من ئێوە ناناسم، بەڵام ئەو دەناسم، باشی دەناسم، بە بینین، هەموو شاری سمیرنا دەیناسن، لەسمیرنا هەموو شتێك ناسراوە.

لە یەکەمین ڕۆژەوە قەشە پیتەر زۆرر شتی لەبارەی تورکە لاوەکەو خێزانەکەیەوە زانی، بەڵکو سەبارەت ئەو شتەی بەرەو ئەم ماڵە سەیرە پاڵی پێوە نا. هەر هەمووی بەو شێوەی توانرا لەم (حاییم)ەوە زانرا (ئەمە ناوی ئەو پیاوەی خەڵکی سمیرنا بوو). ئەوە تێکەڵ و پێکەڵ و هەڵکۆڵین و تێکشکان بوو هەندێکی لە یاد چووەوەو هەندێکیشی چوست و چالاکانەو ڕازاوەو بەردەوام ناناشکراو ڕوون سێ جار دووبارە کردەوە، ئەویش بە وردەکاری جۆراوجۆرو چڕو زیادکراو، چونکە ئەم پیاوەی ناچارە بەردەوام قسەبکات نەیدەتوانی تەنیا سەبارەت بە یەك شت بدوێت. هەندێك ڕادەوەستا، بە مۆن و درژیەو غەمگینی بیری دەکردەوەو وەك بلێیت کارەکە ئازاری بدات، بەڵکو قایلی بکات کە شتێکی باش و دانایانە

نییە لەهەموو شوێنێك باسی هەر هەموویان بكات. بەڵام ئارەزووی زۆر بڵێی سەبارەت بە ژیانی كەسانی دیكە ـ بە تایبەتی ئەوانەی بە پێی پلەو پایەی كۆمەڵایەتییان لەو بەرزتر بوون، یان چارەنووسیان سەیرتر بوو ـ لە هەموو شتێك بەهێزتر بوو.

یەكێك لەوانە بوو كە ژیانیان بەبێ ئامانج دەگوزەرێنن، هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ خەڵك و ئەو كۆمەڵەی تێیدان لە ناكۆكییەكی دۆڕاودا بوو. ئارەزوویەكی زۆری هەبوو هەموو شتێك بڵێت و شی بكاتەوەو پەردە لە ڕووی هەڵەو گوناهەكانی ئادەمیزادان هەڵبداتەوەو، هەموو شتێكی باش هەڵبگێڕێتەوەو، ددان بە هەموو شتێكی خراپەدا بنێت، بەمەیش دوور ڕۆیشت، دوورتر لەوەی هەر مرۆڤێكی ئاسایی دروست دەیبینێت و دەیبیسێت.

دەیزانی ئەو ڕووداوانە كە لە نێوان دوو پیاودا ڕوو دەدەن بێ ئەوەی كەسی دیكە لەوێ بێت بەوپەڕی ڕوونی و وردەكارییەوە بگێڕێتەوە. تەنیا بەوەیشەوە نەدەوەستا باسی ئەو خەڵكە بكات كە قسەیان لەبارەوە دەكات، بەڵكو ڕۆژ دەچووە ناو هزرو ئارەزووەكانیانەوە كە بە خۆی دەیدۆزینەوە. لە جیاتی ئەوان قسەی دەكرد. بەهرەیەكی سەیری لاساییكردنەوەی دەنگی ئەو كەسانە هەبوو كە قسەی لەبارەوە دەكردن ئەویش بەوەی كەمێك دەنگی خۆی دەگۆڕی. جارێك دەبێتە والی، جارێكیش دەرۆزەكەرو، چەند جارێكی دیكەیش شاژنێكی یۆنانی، بە كەمێك جوولەی لەشی یان تەنیا بە ماسوولكەكانی لاسایی شێوازو ڕێ كردن یان جوولەی پیاوێك یان چۆنیەتی دانیشتنی، یان جوولەی گیانلەبەرێك، تەنانەت شێوەی شتە بێ گیانەكانی دەكردەوە.

بەم شێوازە سەیرە حاییم زۆری قسان سەبارەت بە خێزانە گەورەو دەوڵەمەندە جووەكان یان یۆنانییەكان، بەڵكو تەنانەت سەبارەت بە خێزانە توركەكانی شاری سمیرنا دەكرد، بەردەوام لای ڕووداوە گەورەكان یان شتە زەبەلاحەكان ڕادەوەستا، هەر گێڕانەوەیەكیشی بە هاوارێكی سەیر، بەڵكو بە خۆشییەوە كۆتایی دەهێنا: (ئێهـ ؟ ئاهـ!) كە مەبەستی ئەوە بوو بڵێت: (ئێهـ، بڕوانن چی لەم ژیانەدا هەیە! ژیانی هەژارانەو ڕووداوە ساكارەكەی من بۆ ئەوان و بۆ چارەنووسی تێكچرژاویان چی دەگەیەنێت!).

لێرەدا گێڕانەوەیەك كۆتایی دێت و یەكێكی دیكەی بێ كۆتایی دەست پێدەكات.

(دەبینین بەردەوام، بە پلەیەك یان پتر، ئارەزووی سزای توند بەسەر ئەو کەسانەدا دەکەین کە زۆر بلێین، بە تایبەتی کاتێك سەبارەت شتگەلێك دەدوێن ڕاستەوخۆ پێوەندییان بە خۆیانەوە هەیە، ئێمەیش وەك زۆر بلێ و قسەکەری ڕەزا قورس لێیان دەڕوانین. ئەو کاتەیش بیر لەوە ناکەینەوە کە ئەو خەسڵەتە مرۆییە ئەنگە، مرۆییەو زۆر ڕوو دەدات، خەسڵەتێکە لایەنی چاکەیشی تێدایە. چونکە چۆن بێ ئەو دەتوانین ناخ و ناو دەروون و هزری کەسانی دیکە بزانین، چۆن بیر لە کەسانی دیکە دەکەنەوەو ئاکام چۆن بیر لە ئێمە دەکەنەوەو، چۆن بیر لە ئاوەندەکان و شوێنەکانی دیکە دەکەنەوە کە لە ژیانماندا نەمانبینیون و هەرگیز هەلی بینینیشیانمان بۆ هەڵناکەوێت.

ئەگەرچی کەسانێکی وەك ئەوانە نەبوونە، کە ئارەزوویەکی زۆری پێویستیان هەیە ئەو شتانەی بینیویانە یان بە زارەکی بیستوویانە یان بە نووسراوی خوێندوویانەتەوە، یان ئەوەی تاقییان کردووەتەوەو گوزەراندوویانە یان بیریان لێ کردووەتەوە، ئەگەر کەمیش بێت، بخەنە ڕوو، ئەوە شتی زۆرمان نەدەزانی، بەڵام لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی نیوەچڵ شتەکان دەخەنە ڕوو، ئارەزووەکانی خۆیان و شتە پێویستەکانی خۆیان تێکەڵ دەکەن، دەشێت ئەگەر دروست نەبوو ئەو کات لێکەیشتنی خۆمان لە چوارچێوەی ئەزموونەکانمانەوە دەخەینە ڕوو و لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکەین و بە یەکدی بەراوردیان دەکەین. ئەو کات یان لە ئامێزیان دەگرین یان بەتەواوەتی دەیانبێزین، یان نیواو نیو دەمێنینەوە. بەم شێوەیە شتێکی گرنگ لە ڕاستی ئادەمیزاد بۆ ئەو کەسانە دەمێنێتەوە کە بەوپەڕی پشووەوە گوێیان لێ دەبێت یان دەیانخوێننەوە).

قەشە پیتەر بەم شێوەیە لە ناخەوەی خۆیدا بیری دەکردەوە کاتێك گوێی لە قسە فرەوان و زێدەڕۆییەکانی حاییم سەبارەت بە (جەمیل ئەفەندی و چارەنووسی) دەگرت، کە هوشیارییە سەیرەکەی حاییم پتر سستی دەکرد. چونکە ویڕای هەموو ئەو چوست و چالاکییەی لە قسەکردندا هەیبوو کەچی هەندێك جار دەنگی نزم دەکردەوە تا ڕادەی بێ دەنگ بوون، کاتێك وەك کابرایەکی هەڵاتوو تەماشای ئەم لاو ئەو لای خۆی دەکردو، گومانی لە هەموو شتێك دەکرد.

***

# سێیەمین پار

حاییم سەبارەت بە جەمیل ئەفەندی دواو گوتی پیاوێکی (دوو ڕەگە). باوکی تورکەو دایکی یۆنانی. دایکی شاجوانێکی یۆنانی بەناوبانگ بوو. ئەگەرچی شاری سمیرنا شاری ئافرەتە یۆنانییە جوانەکانە، بەڵام ئەو جۆرە بەژن و، ئەو مەزنی و، ئەو دوو چاوە شینەی بە خۆوە نەبینیوە. لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا بە پیاوێکی یۆنانی دەوڵەمەندیان بە شوو دا. (حاییم نازناوێکی یۆنانی دوورو درێژی گۆکرد، بە شێوەیەك گۆی کرد وەك چۆن ناوی وڵاتێکی گشتی ناسراو گۆدەکرێت)، تەنیا یەك منداڵی بوو، ئەویش کچ بوو. کاتێك کیژەکە گەیشتە تەمەنی هەشت ساڵی یۆنانییەکە لەناکاو کۆچی دوایی کرد. خزمەکانی خێرا ڕۆیشتن بێوەژنە گەنجەکەیان فریو دا، لە هەوڵێکدا بۆ ئەوەی ئەو سامان و پارەو پوولەی بەجێی هێشتووە هەڵلووشن. ئافرەتەکە بەرگری لە خۆی کرد. لەو پێناوەدا تا ئەسینا ڕۆیشت بۆ ئەوەی بە لایەنی کەمەوە بتوانێت میراتەکە ڕزگار بکات. کاتێك لە ئەسیناوە بە کەشتی بۆ شاری سمیرنا گەڕایەوە، بێ هیچ نیشانەی نەخۆشییەك منداڵەکەی لەناکاو مرد.

دەریا شەپۆلی دەدا، کەشتییەکەی لەسەرخۆ دەڕۆیشت، شاری سمیرنایش هێشتە دوور بوو. یاساکانیش بە ڕاشکاوی ئاماژەیان بەوە دەکرد کە تەرمی منداڵەکە فڕێ بدرێتە ناو دەریاوە. کەشتییەوانەکان پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت. ئەوانەی ـ بە پێی بڕوایەکی کۆن ـ بڕوایان وایە کە ئەگەر تەرم بەسەر کەشتییەوە بمێنێتەو ئەوە چارەنووسی ناخۆش بەدوای خۆیدا دێنێت، لەبەر ئەوەی گیانی کۆچکردوو کەشتییەکە وەك قورقوشم بەرەو لای مانگ ڕادەکێشێت. بۆیە دایکە دڵسووتاوەکە تا توانی پێداگیری کردو بەرهەڵستی ئەو بڕیارەی کرد، لەسەر ئەوە سووربوو تەرمەکەی بۆ بەجێ بهێڵن، بۆ ئەوەی هەرکە دەگەنە شاری سمیرنا بە خۆی بینێژێت و، بە لایەنی کەمەوە بزانێت شوێنی گۆڕی کیژە تاقانەکەی لە کوێیە. کاپتنی کەشتییەکە زۆری لەگەڵ شەکەت بوو. کاتێك کاپتن بینی لە بارودۆخێکی مەترسیداردایە ـ لە نێوان ژان و ئازاری دایکەکەدا کە دڵی نەدەهات جگەر گۆشەکەی بەجێ بهێڵێت و، لە نێوان ئەو یاسا توندانەی کەس ناوێرێت سەرپێچییان لێ بکات ـ بە ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەفسەری کەشتییەکەدا فێڵێکی گونجاویان دۆزییەوە.

فەرمانی دا دوو دارەتەرمی چوون یەك دروست بکرێت، تەرمی کیژەکەیان لەناو یەکێکیاندا داناو، کەشتییەوانەکان بە نهێنی خستیانە ناو دریاوەو، ئەوەی دووەمیشیان بە قورساییەکی گونجاو پڕکردو بزمار ڕێژیان کردو سەریان داپۆشی و تەسلیمی دایکەکەیان کرد، وەك بلێیت ملکەچی ئارەزووی ئەو بوویێت. کاتێك گەیشتنە شاری سیرنا دایکەکە دارەتەرمەکەی بردو، لە گۆڕستاندا ناشتی.

دایکەکە زۆری خەفەت بۆ لە دەستدانی کیژەکەی خوارد. هەموو ڕۆژێك سەری لە گۆڕی کیژەکەی دەدا. لە کاتێکدا کە ئەوەی ئافرەتی لاوو جوان بە تێپەڕبوونی کات خەریك بوو تۆزێك ئەو کۆستەی لەیاد دەچووەوە، شتێکی نالەباری پێشبینی نەکراو ڕووی دا. ژنی ئەفسەری یەکەمی ئەو کەشتییەی کیژەکەی تێدا مردبوو لە مێردەکەیەوە نهێنی ئەو فرت و فێڵەی زانی کە بە مەبەستی نیازپاکی ئەنجام درابوو، لەگەڵ چارەنووسی تەرمی کیژە مردووەکە، بۆیە ڕۆژێکیان ئەو نهێنییەی بۆ دەستە خوشکێکی خۆی درکاند. دوای دەمەقاڵێیەکی ئاسایی نێوان ئافرەتان ئەو ئافرەتە بە گێلایەتی خۆی و ئارەزووی تۆڵەسەندنەوە، ئەو نهێنییەی لەبەردەم ئەوانی دیکەدا درکاند. بە شێوازێکی دڕندانەی تێنەگەیشتراوو تەم و مژاوی کارەکە گەیشتە بەر گوێی دایکەکە. ئەوەیش وای لەم ئافرەتە بەدبەختە کرد لە خەفەت و سۆزی دەروونیدا شێت بێت. بەرەو گۆڕستانەکە تێی تەقاندو، بە نینۆکەکانی خۆڵی سەر گۆڕەکەی هەڵکەند، بەڵام خەڵکی بە زەبری هێز نەیانهێشت ئەو کارە بکات، دواتریش بەندیان کرد، پاش ئەوەی ویستی بەدوای کیژەکەیدا خۆی بخاتە ناو دریاوە. شێتییەکی ڕاستەقینە بوو. کارەکە وای پێویست کرد چەندین ساڵی دیکە تێپەڕێت تا ژنەکە چاك ببێتەوەو غەمە نوێیەکانی بیر بچێتەوە، بەڵام لە ژیانی خۆیدا بەتەواوەتی چاك نەبووەوە.

کەسانێکی زۆری یۆنانی داوایان لەو بێوەژنە جوان و بەدبەختە کرد مێردیان پێ بکات، بەڵام تا دەهات ڕەتی دەکردنەوە، لە کاتێکدا هەستی بە پاشقولدان و ئەشکەنجەی دەستی خزم و هەموو هاوڕەگەزانی خۆی دەکرد. بەڵام پاش چەند ساڵێك، لەکاتێکدا هەموو خەڵك سەریان سوڕما کە مێردی بە کابرایەکی تورك کرد.

دەوڵەمەند بوو، بەتەمەن زۆر لەو گەورەتر بوو، پلەو پایەیەکی باشی هەبوو، خوێندەوار بوو، بە گەنجی چەند پلەو پایەی لە کاری فەرمیدا وەرگرتبوو، ناوی تاهیر پاشا بوو، بە تەنیا دەژیا: هاوینان لەناو باخەکەی لە تەنیشت سمیرناوە دەژیا، زستانانیش لە ماڵە گەورەکەیدا لە شار. داوای لە هاوسەرەکەی نەکرد ئایینی خۆی بگۆڕێت، بەڵام ئەویش بێ سەرپۆش نەدەچووە دەرەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەم هاوسەرگیرییە بە لای یۆنانییەکانەوە جێی بێزو نەفرەت بوو. مێرکردنی ئەو ئافرەتە گەنجە یۆنانییە بە پاشایەکی تورکی تەمەن شەست ساڵە نەك هەر شادو بەختەوەرانە بوو، بەڵکو بەپیت و فەڕیش بوو. لە دوو ساڵی سەرەتادا دوو منداڵیان بوو، کوڕێك و کچێك. کوڕەکە بەهێزتر بوو زوو گەشەی کرد، کیژەکەیش لاواز بوو لە تەمەنی پێنج ساڵیدا بە نەخۆشییەکی نەزانراو دووای ئەوەی دوو ڕۆژ لە جێگەدا بوو مرد. دایکەکە کە وەك پێویست بوو یەکەمین غەم و خەفەتی لە بیر نەچووبووەوە بۆیە تووشی ڕەشبینییەکی ئەوتۆ بوو چاك نەدەبووەوە. باش لە ڕووداوەکە کۆڵییەوە تا بۆی دەرکەوت هێزێکی باڵا دەستی لە مردنی کیژی دووەمیدا هەیەو، هەستی کرد نەفرەتی لێ کراوەو شایەنی منداڵ بەخێوکردن نییە، بۆیە بە تەواوەتی مێردەکەی و کوڕەکەی پشت گوێ خست، تا دەهات لاوازو بێ هێز دەبوو، ساڵی دواتر مرد.

ئەو منداڵەی ناوی (جەمیل)یان لێ نابوو، بە ڕاستی جوان بوو. (لە دایکیەوە جوانی بۆ مابووەوە بەڵام جوانییەکی پیاوانە) ژیرو زیرەك بوو، بەخۆوە بوو. لە ناو هاوەڵەکانیدا یەکەمین مەلەوان بوو، لە هەموو یارییەکانی زۆرانبازیدا دەیبردەوە. بەڵام لە تەمەنێکی زوودا دەستی بە پشت گوێ خستنی وەرزش و یاری و ڕابواردن لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆیدا کرد، بیری تەواوی لای زانست و کتێب بوو. باوکیشی هانی ئەوەی دەدا، کتێب و مامۆستایانی بۆ دەستەبەر دەکرد، گەشتێکی زۆری بۆ دابین دەکرد، تا زمانی ئەسپانی لای یەکێك لە سفەردیمەکان فێربوو کە ئەویش پیرەمێرد (ڕابین)ی خەڵکی مسرنا بوو.

زستانێك تاهیر پاشا مرد. لاوەکە لەگەڵ مولکێکی زۆردا مایەوە، بێ ئەوەی هیچ شارەزایی یان خزمێکی نزیکی هەبێت. پلەو پایەی تاهیر پاشا باشترین پشت و پەنای

بوو. پێشنیازیان بۆ کرد لە دەزگەی فەرمیدا کار بکات، بەڵام ڕەتی کردەوە. جیاوازیشی لەگەڵ هاوتەمەنەکانیدا ئەوەبوو کە لە ژیانیدا هیچ ناکۆکییەکی لە پێناوی ئافرەتان و لە پێناوی هاوەڵی کردنیان لەگەڵ هیچ کەسدا نەبووە. بەڵام ئەوەی ئەو هاوینە تووشی هات کاتێك بە تەنیشت شوورەی باخچەیە بچووکی واڵادا تێپەڕی، ئەو ڕووداوە یەکسەر هەموو شتێکی هەڵەوگێڕکرد کاتێك لاوەکە کیژێکی یۆنانی بینی. ئەو خۆشەویستییە لەناکاوە تەواو گەنجەکەی گۆڕی. کیژەکە کیژی بازرگانێکی یۆنانی بچووك بوو. لاوەکە بڕیاری دابوو بیبات وەك چۆن تاهیر پاشا ڕۆژێك لە ڕۆژان بڕیاری دا دایکی ببات. هەموو شتێکی پێشکەش کرد بێ ئەوەی هیچ مەرجێك دابنێت. ئەو کیژەی کە دوو یان سێ جار بینیبووی ئارەزووی ئەوەی کرد بچێتە لای، بۆیە شێوازێکی دۆزییەوە ئارەزووەکەی خۆی پێڕاگەیاند. بەڵام دایك و باوکەکە بەرهەڵستی ئەوەیان کرد کیژەکەیان بە تورکێك بدەن، کام تورکیش، ئەوەی کە دایکی یۆنانی بوو لەوەیشدا گەرەکی یۆنانییەکان هەموو پشتیوانییان لێ کردن. هەموو مەزەندەی ئەوەیان کرد کە تاهیر پاشا، ئەگەرچی مردووشە، بۆ دووەمین جار دەیەوێت ئافرەتە یۆنانییەکی دیکە بڕفێنێت. هەرچی باوکی کیژەکەیە ـ کە بازرگانێکی پیسکەی کورتە باڵای ڕوح هەژار بوو ـ وەك پیاوێك ڕەفتاری کرد لەناکاو بارێکی لووت بەرزی و پاڵەوانیەتی و ئارەزووی قوربانیدان لەساتێکی شێتایەتیدا بە خۆوە بینیبێت. وەك تارماییەك هەردوو دەستی پان کردەوەو بەرانبەر هاوڕەگەزەکانی خۆی هاواری کرد: (من بە پلەو پایەو سامانەوە کابرایەکی بچووکم، بەڵام بە ئایین و لە خواترسی بچووك نیم. ئەوە بەباشتر دەزانم تەمەنی خۆم لەدەست بدەم و تەنیا کچەکەم فڕێ بدەمە دەریاوە لەوەی بە خوانەناسێکی بدەم). بەم شێوەیە جووڵایەوە، وەك بڵێیت پیاوو ئایینەکەی گرنگترن و کیژەکەی شتێکی لاوەکییەو هیچ بایەخێکی نییە. ئەو پاڵەوانیەتەی لەو بازرگانە بچووکە لە شەقامێکی سەرەو لێژکە هیچ شتێکی ئەوتۆی نەدەگەیاند. ئەو هەڵەیشی بۆ ڕێك نەکەوت ببێتە شەهیدی ئەشکەنجەدراو. بێ دەنگ و نهێنی و بەبێ زەماوەند کیژەکەیان بە زۆر لە یۆنانییەکی خەڵکی دەرەوەی سمیرنا مارە بڕی. ڕۆژی زەماوەندەکەو دەست پێکردنی زەماوەندەکەیان

ئاشـكرا نـەكرد. لـەوە ترسـان جـەميل بيرِفێنێـت. بـەڵام جـەميل ماوەيـەكى پێـشتر كشابووەودو برينەكانى خۆى لەئاميز گرتبوو. ئەو كات بوو هەموو ڕاستييەكى بە تەواوى بـۆ دەركـەوت ئـەوەى كـە پێـشتر خـەونى پێـوە نـەدەبينى كاتێـك لاوێكـى دەوڵەمەنـدى سەرگەردان بوو. دركى بەوە كرد كە چى دەگەيەنێت كاتێك پياو لەو ئافرەتـە دەكرێتـەوە كە خۆشى دەوێت و، بە گشتى خەڵكى لێك دى دەكرێنەوە.

پاش ئەوە جەميل بە مەبەسـتى خوێنـدن لـە ئەسـتەنبوڵ دوو سـاڵ مايـەوە، دواتـر گەڕايەوە سميرنا بە شێوەيەك گۆڕابوو، لە جاران بەتەمەنتر دەهاتە پێش چاو. خۆى بە تاك و تـەنيا بينييـەوە، ئـەوەى لـە يۆنانييـەكانى دوور دەخـستەوە زۆر بـوو، ئـەوەيش بـە توركەكانيەوە دەبەست زۆر كەم بوو. هاوەڵەكانى سەردەمى هـەرزەكارى، ئەوانـەى تـەنيا بەر لە تەنيا چەند ساڵێك بە ڕابواردن و يارى كـاتى لەگەڵـدا بەسـەر دەبـردن، لێـى دوور كەوتنەوەو بوونە نەناسراو، وەك بڵێيت كەسانێكى خەڵكى شوێنێكى ديكە بـن. بـوو بـە كابرايەك تەنيا لەگەڵ كتێبدا دەژيا. لە تەمەنى بيست و چوار ساڵيدا بوو بـە كابرايـەكى گۆشەگيرى دەوڵەمەنـد نەيدەزانى چـى هەيـە و لـە كـوێى دانـاون و چۆن ئـەو موڵكانـە هەڵسووڕێنێت و مامەڵەيان لەگەڵ بكات. گەشتێكى بە درێـژايى ئاسـياى بـچووك كـرد. چووە ميـسرو دووورگەى (ڕۆد)و لە دەستى ئەوانە هەڵهاتبوو كە بە ناوو پلەى كۆمەڵايـەتى سـەر بەوانـە، ئەوانـەى وا تەماشـايان دەكـرد وەك چـۆن تەماشـاى پيـاوێكى نەناسـراوى تاراوگە بكەن، تەنيا هاودەمى خەڵكانێكى زاناى دەكرد، بەچاوپۆشين لە نژادو ئايينيان و چين و چ كارەن.

پارساڵ پڕوپاگەندە لە شارۆچكەى سميرنا بڵاوبووەوە، پڕوپاگەندەى بێ سـنوورو تـەم و مژاوى، وەك ئەو چرپانەى دەيانگوت كە كوڕەكەى تاهير پاشا كتێـب لـە مێـشكى داوەو هيچ لەسەر خۆى نييەو، هەرگيز لـە حاڵـەتێكى ئاسـايى و دروسـتدا نييـە، چـونكە وەك پێويست ئادەميزاد نييە. دەشيانگوت كاتێك مێژووى ئەمپراتۆريەتى توركياى دەخوێند، ئـەوەى خوێنـدبوو، هـەروەها خـەياڵى بـۆ ئـەوە چـووبوو كـە گيـانى يـەكێك لـە ميـرە بەدبەختەكان لە ناخيدايەو، گەيشتبووە ئەو بڕوايەى كە سوڵتانێكى ددان پێدا نەنراوە.

ـ نێه !ـ حاییم تۆزێك گێڕانەوەكەی ڕاگرت، بێ ئەوەی شیكردنەوەی نەریتەكانی شارۆچكەی سمیرنای لە یاد بچێتەوە، كە تەنیا ئەوی نەبیزاودو بۆ ئەم بەندیخانە بێزراوەی دوور نەخستووەتەوە ـ وەك خۆی لە ڕاستیدا وایە ـ ئەوەیشی لەگەڵ كەسانی شكۆمەندی دیكەیشدا كردووە كە پلەو پایەیەكی كۆمەڵایەتی بەرزیان هەیە وەك جەمیل ئەفەندی، پاشان درێژەی پێدا:

ـ كاتێك دەڵێم پڕو پاگەندە لە سمیرنا دەستی بە بڵاوبوونەوە كردووە هەرگیز نامەوێت ئەوەتان بەبیردا بێت ئەوە هەر هەموو خەڵكی ئەم شارۆچكەیە دەگرێتەوە كە خەڵكێكی زۆری لێیە. نا. كەواتە شارۆچكەی سمیرنا چییە؟. كاتێك لە بەرزاییەوە تەماشای دەكەیت، لەو پێدەشتەی دەكەوێتە ژێر بانە مەخمەڵییەكەوە، وات دێتە پێش چاو كە هەرگیز كۆتایی نییە. بەڕاستی شارێكی فرەوانەو ماڵێكی زۆرو دانیشتوانی زۆری لێیە. بەڵام ئەگەر ڕاستت بوێت ئەوە لەسەد خێزان تێناپەڕێت. پەنجایان خێزانی توركن، ئەوەندەشیان یۆنانین، ژمارەیەكی كەمی دەست و پێوەندی دەستەڵات لەدەوری والی و بەڕێوەبەری بەندەرەكەن، هەر هەموویان هەزار تا دوو هەزار كەسن. ئەمە هەموو شتەكەیە. ئەوەیش ئەوەندە گرنگە، چونكە بڕیار لەسەر زۆر شتی گرنگ و جەوهەری دەدات، مادامەكێ ئەوانی دیكە تەنیا بایەخ بە ئیش و كاركردن دەدەن تا ژیان و گوزەرانی خۆیان و خێزانەكانیان دابین بكەن. هەرچی سەد خێزانە ئەوانە ئەگەر لەگەڵ یەكدی نەبن و سەر لەیەكدی نەدەن، هەر یەكەیان زۆر شت لەبارەی یەكدییەوە بزانن، لەبەر ئەوەی چاودێری یەكدی دەكەن و لەیەكدی دەڕوانن، بەڵكو لەیەكدی ورد دەبنەوەو یەكدی دەپێون و، بەم جۆرە ئەوە دوای ئەوە بەدوای یەكدیدا دێن. جەمیل سەر بەم كەمایەتییە بوو چ لە دایك یان لە باوكەوە بێت. لەبەر ئەوەی چارەنووسی ناسروشتیانەی خێزانەكەی و شێوازی ڕۆژئاوایانەی ژیانی، هەر لەمێژ بوو سەرنجی كەسانی دیكەی بۆ لای خۆی ڕادەكێشا. لە شارۆچكەی سمیرنا هەواڵەكان دەگێڕرێنەوەو دووبارە دەكرێنەوەو، لە پشتە ملە قسە دەكرێت، بەڵكو وەك هەر شوێنێكی جیهان زێدەڕۆیی تێدا دەكرێت، بەڵكو لەوە پتریش.

هەرچــی (جــەمیل)ە، کــە لــەم ســاڵانەی دوایــیــەدا بەشــداری ژیــانی هــاوەڵ و هاوتەمەنەکانی خۆی ناکات و، تێکەڵاوی لاوە دەوڵەمەندەکان نابێت، لەپشتە ملـە زۆر شتیان لەبارەوە دەگێڕایەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی تێکەڵ بە کەس نەدەبوو. بۆیـە خـەڵکی بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و هەندێك جاریش بە گاڵتە پێکردنەوە باسی خوێندنەکانی لەبارەی مێژووەوە دەکرد.

لە بالکۆنێکەوە دە لاوی بەڕێز دانیشتبوون، لە گەڵ هـەمان ژمـارەی کـچی ئـازادی خـەڵکی بەنـدەر جگـەرەیان دەکێـشاو دەیـاخواردەوە، کـە یـەکێکیان باسـی جـەمیل و بەدبەختی وی و شـێوازی ژیـانی ناناسـاییانەی وی بـوو. یـەکێك لـە برادەرەکـانی گـوتی جەمیل لە ژیانی بایەزیدی دووەم دەکۆڵێتەوە بە وردەکارییەکانیەوە، بـە تایبـەتی ژیـانی سـوڵتان (جـەم)ی بـرای. لـەو پێناوەیـشدا گەشـتێکی بـۆ میـسرو دوورگـەی ڕۆد کـرد، ئێستەیش خۆی بۆ گەشتی ئیتالیاو فەرەنسا ئامادە دەکات. کیژەکان پرسیاریان کرد تـۆ بڵێیت ئەو سوڵتان (جەم)ە کێ بێت؟. لاوەکـە ئـەوەی بـۆ ڕوون کردنـەوە کـە تـەنیا بـرای بایەزیدو دوژمنی سەرسەختیشی بـوو، کـە لـە کـاتی ململانـێ لەسـەر تـەخت شکـستی خـواردو، بـەرەو دوورگـەی ڕۆد هـەڵات و، خـۆی بـە دەسـتی مـیرە کریـستیانەکانەوە دا. فـەرمانڕوا کریـستیانەکان پـاش ئـەوە چـەندین سـاڵی دوورو درێـژ بـە دەسـت بەسـەری هێـشتیانەوەو، بـەردەوام دژ بـە ئەمپراتۆریـەتی عوسـمانی و سـوڵتانی شـەرعی بایەزیـد بەکاریان دەهێنا. لەوێ لە شوێنێك مرد. سوڵتان بایەزید تەرمی براکـەی هێنایـەوەو لـە (بۆرسە) ناشتی و، هێشتە گۆڕەکەی لەوێیە.

لەو ساتەدا لاوێکی سـەرکێش، یەکێك لەوانەی ئەندێشەی تیـژو قـسەی ناماقووڵیـان خراپترین زیان بە خۆیان و زۆرتریش بە کەسانی دیکە، خۆی تێهەڵقورتاند.

- پاش ئەوەی جەمیل لە خۆشەویـستی ئـەو کیـژە یۆنانییـە جوانـە شکـستی هێنـا، حەزی لەو مێژووە کرد کە زۆری خۆش ویست، تا ئاگەدار بوو، بـوو ڕازگـری (جـەم). بـەم شێوەیە دەردەکەوێت و، بەم شـێوەیە ڕەفتـار دیـەکات و پێشوازی لـە هـەموو شـتێکی

دەورو بەری دەکات. بۆیە برادەرەکانی لە قسەکانیاندا بە ناوی سولّتان جەم بانگیان دەکردو گالّتەیان پێ دەکرد.

بەم شێوەیە، کاتێك ناوی سولّتان دەهێنرا، بە تایبەتی ئەگەر ناوەکە پێوەندی بە ناکۆکی یان شەڕو شۆڕی ناو ئەمپراتۆریەتەوە بێت تەنانەت ئەگەر لەسەردەمێکی زۆر کۆندا ڕووی دابێت، ئەوە لەم شوێنەی خۆیدا لەناو ئەو گرووپی برادەرانەدا نەدەما کە ئەوەیان باس دەکرد. بەردەوام بالّندەیەك هەبوو بالّی دەگرتەوە بە سولّتان یان پیاوەکانی ڕادەگەیاند کە ناوی سولّتان هێناوەو، ناوی کابرایان دەدرکاندو چی گوتووە. بەم شێوەیە بوو نارەزووە نهێنی و بێ مەبەستەکانی جەمیل لە زاری یەکێکیانەوە گەیشتە گوێی سیخوڕێك و لەوێشەوە گەیشتە بەر دەرگەی والی (ئیزمیر)کە بە شێوەیەکی دیکە پێشوازی لێ کراو واتایەکی نوێی وەرگرت.

ئەو کاتە والی (ئیزمیر) ئەفسەرێکی توندو زۆر تووڕە بوو، پیاوێکی گەوجی گوماناوی بوو، لە خەونیشدا لەوە دەترسا هەڵەیەکی سیاسی لە دەست ڕوو بدات یان پیلانێك بگێڕێت یان شتێکی لەو شێوەیە ڕوو بدات.

(بەڵام هەموو ئەو توندی و تووڕەبوونەیش لە کاری حکومەت و لە کاری سیاسی ڕێی ئەوەیان لێ نەگرتبوو بەرتیل لە بازرگانان و خاوەندی کەشتییەکان وەرنەگرێت. بۆیە قازی ئیزمیر لە بارەیەوە گوتبووی کە کابرایەکی کورت بیرو پەنجە درێژە ).

ئەوەبوو یەکەمین شت کە والی بیری لێ کردەوە ـ کاتێك گوێی لەو هەواڵگرییە بوو لەبارەی جەمیلەوە، ئەو هەواڵگرییەی کە هەرگیز لاوەکە بیری لێ نەکردبووەوە ـ ئەو ڕاستییە ڕووتەیە کە بە ڕاستی سولّتانی ئێستە برایەکی هەیە، بە خەڵکی ڕاگەیاندبوو کە مرۆڤێکی شێتە، دەیانگوت دەست بەسەرە. خەڵکی هەموو دەیانزانی، ئەگەرچی کەس باسی نەدەکرد. ئەم ڕووداوە ورووژاندی و، بەراوردەکەیش ئەوەندەی دیکە ئاگرەکەی خۆش کرد. ئەوەبوو لەو ڕۆژانەدا لە بەشە ئەوروپاییەکەی تورکیا هەندێك ئاژاوەو هەراو هوریا ڕووی دا. سولّتان لە ئەستەنبوڵەوە نامەیەکی توندی ئاراستە کرد لەم والییەوە بۆ ئەو والی، تێیدا ئەو والیانەی لە هەموو لایەکی وڵاتدا ئاگەدار کردبووەوە ئاگەیان لە

خۆیان بێت و چاودێری هەموو خراپەکارو ئاژاوەچییەکان بکەن کە دەیانەوێت کارەکانی حکوومەت تێك بدەن. بۆیە والی، وەك ئەفسەرێکی خراپ، مەزەندەی ئەوەی کردبوو کە ئەویان مەبەستە. بە شێوەیەك ئەو مەزەندەیەی کردبوو کە ئەو ورياکردنەوەیە تەنیا مەبەستی پلەو پایەکەی ئەوە. جا لەبەر ئەوەی لە هەموو ویلایەتەکە هیچ ڕووداوێك نەبوو بۆیە مەبەست ڕووداوەکەی (جەمیل)ە.

شەوێکیان پۆلیس دەورەی ماڵی (جەمیل)یان داو پشکنییان و هەموو کتێب و دەستنووسەکانیان بردو (جەمیل)یان لە ماڵەکەی خۆیدا دەست بەسەر کرد.

کاتێك والی ئەو کەڵەکە کتێبەی بینی، بینی بە چەندین زمانی جۆراوجۆر نووسراون و، چەندین دەستنووس و تێبینی بینی، سەری سوڕماو تووڕەبوونێکی ئەوتۆ تووڕەبوو تا ڕادەیەك بڕیاری دا خاوەنەکەی بەند بکرێت و، لەگەڵ کتێب و کاغەزەکانیدا ڕەوانەی ئەستەنبووڵ بکرێت. والی نەیتوانی بە خۆی هۆی ئەو تووڕەبوون و ڕقە شی بکاتەوە کە ئەم کتێبانە، بە تایبەتی کتێبە بیانییەکان بەو ژمارە زۆرانەیانەوە، خستیانە ناخ و دەروونیەوە. بەڵام تووڕەبوون و ڕك لێبوونەوە بەدوای هۆدا ناگەڕێن، بەڵکو وەك باوە، ئەمیان ئەوی دیکە دەورووژێنێت و، شان بە شانی یەکدی گەشە دەکەن.

والی لەوە دڵنیا بوو کە هەڵەی نەکردووەو دەستێکی باشی وەشاندوەو لە جێی خۆیدایە. هەواڵی بەندکردنی کوڕەکەی تاهیر پاشا ژمارەیەکی زۆر لە پیاوە پلەدارەکانی وروروژاند، بە تایبەتی زانایانی موسوڵمانەکان. قازی و زاناو بەساڵداچوو و دۆستی تاهیر پاشا بە خۆی چووە لای والی و، بگرە سەربوردەی ڕووداوەکەی (جەمیل)ی بۆ شی کردەوە، گوتی لاوێکی لێبوردو بێ تاوانە، دەشێت بەجۆری ژیان و گوزەرانی بە نموونەی ئەو لاوە باش و بەڕاست موسوڵمانە بژمێررێت، ئەوەبوو بە هۆی نەویندارییەکی سەرنەکەوتووەوە کە شەکەتی کردبوو، تووشی ڕەشبینییەکی دژوار بوو، بۆیە خووی دایە زانست و کتێب، ئەگەر لەوەیشدا زێدەڕۆیی کردبێت ئەوە پێویستە وا تەماشای بکرێت کە ئەوە نەخۆشییەکەو کارێك نییە مەبەستی خراپی لە دواوە بێت، بۆیە پێویستی بە بەزەیی پێداهاتنەوەو لێ گەیشتن هەیە نەك گرتن و سزادان و، هەموو کارەکەیش تەنیا

له لێك تێنهكهیشتن بهو لاوه شتی دیكه نییه، ئهوهی ئهو سهرقاڵیهتی بریتییه له مێژوو، واته زانست، زانستیش زیانی لێ ناكهوێتهوه، بهڵام ههر ههموو ئهو شتانه لهبهر ئهوپهڕی گهوجایهتی و گومانی ئهفسهرهكه بێ سوود بوون.

ـ ئهفهندی من نامهوێت بهو شته سهری خۆم بئێشێنم. من مێژوو نازانم و، ناشزانم چ ناوێكتان لێ ناوه، لهو بڕوایهدام كه باشتر وایه ئهویش نهیزانێت و، زۆریش لهوه ورد نهبێتهوه كهچۆن و بۆچی ههر سوڵتانێك له سوڵتانهكان چی له ژیانی خۆیدا كردووه، بهڵكو پێویسته ئهوهی سوڵتانی ئێستهو فهرمانڕهوا پێی دهڵێت ببیسێت و گوێڕایهڵ بێت و بهگوێی بكات.

ـ ئهوه زانسته، ئهوانه كتێبن!

قازی به تووڕهییهوه قسهكهی پێ بڕی بهخۆیشی له ناكامی ئهزموودهكانیهوه ئاستی ئهو زیانهی دهزانی كه ئهو جۆره پیاوانه به كۆمهڵ و به تاكهكانی دهگهیهنن، كه بیر تهسك و بڕوایهكی لهڕادهبهدهریان به ئهقڵی خۆیان و باش مهزهندهكردنی شتهكانیان ههیهو بڕوایهكی ڕههایان به ههر گفتێك له گفتهكان و ههر دهرهنجامێك له دهرهنجامهكانی خۆیان ههیه.

ـ نێ، مهبهستت ئهوهیه ههر كتێبێك لهو كتێبانه سوودیان نییه. سوڵتان جهم بۆ پلهو پایهكه پاڵێوراوه! واته جهنگ له پێناوی تهختدا!. وشهكهی لهزار دهرچوو، چونكه ئهگهر گهیشته بهر گوێ هێز نییه ڕایبكرێت، بهڵكو تا دوورترین جێ دهڕوات و، بهرێگهوهیش گهورهتر دهبێت و دهگۆڕێت. من ئهو وشانهم نهگوتووه، ههروهها من هۆكاریشیان نهبووم، بهڵكو بهخۆی بوو، بۆیه پێویسته لێیان بهرپرسیار بێت.

ـ بهڵام زۆر شتیان داوهته پاڵ پیاوهكه كه نهیگوتوون و نهیكردوون! ـ جارێكی دیكه قازی ویستی بهرگری له لاوهكه بكات.

ـ ئهگهرچی ئهوان تاوانباریان كردبێت و زوڵمیان لێ كردبێت، با خۆی بشوات، دواتر پاك دهبێتهوه. من كتێب ناخوێنمهوهو ناشمهوێت بیر له كهسانی دیكه بكهمهوه. با ههر یهكه بیر له خۆی بكاتهوه. پاشان بۆچی دهبێت من به هۆی ئهوهوه بلهرزێم ؟ لهم

ویلایەتەی مندا پێویستە هەر یەکە لە ئاکامی خراپەی کردەوەو قسەکانی خۆی ئاگەدار بێت. ئەوەی دەیزانم تەنیا یەك شتە: یاساو سستم.

قازی سەری بەرز کردەوەو توندو سەرزەنشتیکارانە تەماشای کرد:

- لەو بڕوایەدام ئێمە هەموو بەرگرییان لیّ دەکەین!

بەلاّم پیاوە لووت بەرزەکە تێنەگەیشت و ڕانەوەستا.

- بەلّیّ، یاساو سستم. هەر کەسێك سەری لەسەروویانەوە بەرز بکاتەوە بۆی دەپەڕێنم. من فەرمانبەری سولّتانم، تۆلّە لە هەر هەموو کەسێك دەکەمەوە تەنانەت ئەگەر کوڕە تاقانەکەی خۆیشم بێت. من ناتوانم بەرگەی نینۆکەکانی پەنجەی خۆم بگرم، نەخواستە ئەو عەلمانییە گومان لێکراوەی ئەم ئەفەندییە لاوە.

- دەشێت ئەوە لێرە لێی بکۆلّرێتەوەو ڕاستییەکە دەربکەوێت.

- نا ئەفەندی. ڕێنوێنی هەر ڕێنوێنییە. ڕێنوێنییەکان ئەوە نالێن، بەلّکو کوتومت وەك من دەلّێم. قسەی لەبارەی سولّتان و کاروباری سەلّتەنەتەوە کردووە، بۆیە پێویستە لەبەردەم خودی سولّتاندا لێپرسینەوەی لەگەلّ بکرێت. ئەوە ئەستەنبولّە، با خۆی بڕواتە ئەویّ و بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانەی خوێندوونیەوەو نووسیونی و لەبەردەم خەلّکدا گوتوونی لەویّ ڕوون بکاتەوە. با ئەوان سەری خۆیان لەپێناودا بجەڕێنن. ئەگەر لەسەر هەق بوو ئەوە لە هیچ شتێك لێی مەترسن.

کارەکە تا ئێرە کۆتایی هات. قازییە بەساڵداچووەکە تەماشای ئەو والییەی بەردەمی کرد. سمێلی تاشرابوو، کورتە بالاّیەکی لاوازو، ناتوانا بوو، جێی پێنج نانی لە سکدا نەدەبووەوە کەچی توانای هەر هەموو ئەم خراپەکارییەی هەبوو، بەخۆی گومانی هەبوو، کەللە ڕەق بوو، بەردەوام لە دوو گریانەدا ئامادە بوو خراپترین گریانە هەلّبژێرێت، کاتێکیش لە شتێك بترسیبایە - وەك ئێستە - بە ڕاستی دەبووە مرۆڤێکی ناقۆلاّ. بە ڕوونی بۆ قازی دەرکەوتبوو کە قسەکردن لەگەلّ (والی)یەکی لەم جۆرە سوودی نییە کە هیچ شتێك ناکات ئەوە نەبێت کە لە ناخیدا شاردوویەتییەوە، بەلّکو پێویستە بە دوای شێوازی دیکەی یارمەتیداندا بگەڕێت.

لەگـەڵ گرتنــە بــەری ڕێ و شــوێنی تونــدو پاســەوانییەکی تونـدتۆڵ و بـە نهێنـی (جەمیل)ی ڕەوانەی ئەستەنبوڵ کرد. (ئەمە تەنیا ئاسانکاری بوو کە والی لەبـەرخاتری قازی ئەنجامی دا) هەموو کتێب و دەستنووسەکانی بە مـۆرکراوی لەگەڵـدا ڕەوانـە کـرا. کاتێك قازی و برادەرەکانی بەوەیان زانی یـەکێك لـە پیاوەکـانی خۆیـان بەدوایـدا ڕەوانـە کرد، بۆ ئەوەی شتەکە بۆ ئەستەنبوڵ ڕوون بکاتەوە و، یارمەتی لاوە بێ تاوانەکە بدات. کاتێك پیاوەکە گەیشتە ئەستەنبوڵ (جەمیل)یان بۆ لای لەتیف ئاغا ڕەوانە کردبـوو بـۆ ئەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات و لە بەندیخانەی توند بکات.

بەم شێوەیە مێژووی جەمیل ئەفەندی دەستی پێکرد، بەو شێوەیەی کە حاییم تـوانی بیزانێت و بیبینێت. ئەمەی بە کورتی گێڕایـەوە بـێ ئـەوەی دووبـارەی تێـدا بێـت و بـێ ئەوەی تێبینییەکانی (ئێێێ! ئاه..) زۆر جار دووبارە بکاتەوە.

# چوارەمین پار

قەرەقۆز زۆری ڕك لە تاوانبار سیاسییەکان دەبووەوە. پێی باشتر بوو ململانێ لەگەڵ سەد تاوانبارو تاوانکاری گەورەو بچووکی جیهانی تاوانکاریدا بکات، بەڵام هیچ پێوەندییەکی بە تاکە تاوانبارێکی سیاسییەوە نەبێت. لەرزی لێ دەهات کاتێك گوێی لە هەواڵەکانیان دەبوو. لە گۆڕەپانەکەیدا جێی کردبوونەوەو بەرگەی گرتبوون و بە (ڕێبوار)ی دانابوون. بەڵام لە ژیانیدا ئارەزووی نەکردووە کاریان لەگەڵ بکات. خۆی لێ دوورەپەرێز دەگرتن و وەك بڵێیت تووشی پەتایەك بوونەو ئەو لێوەیان تووش دەبێت. هەوڵی دەدا زوو خۆی لە هەموو شتێکی (سیاسی) و هەموو ئەوانە قوتار بکات پێوەندییان بەو ناوەوە هەبێت. سەری لەو گێراوە سوورِ دەماو ڕووی درژ دەبوو کە لە شاری سمیرناوە هێنرابوو: سەر بە خێزانێکی تورکی ناودارە، شان بە شانی چەند سندووقە پڕ لە کتێب و دەستنووس هێنایان، نازانرێت ئایە شێتە یان ژیرە، (چونکە شێتەکان و ئەو شتگەلەی پێوەندییان پێوە هەیە ترسێکی تۆقێنەرو بێزهاتنەوەیەکی خۆرسکی لە ناخ و دەروونی قەرەقۆزدا دەچێنن). بۆیە نەیدەتوانی لە بەندیخانەکە وەری نەگرێت. بەم شێوەیە جەمیل لە ژوورێکی هاوبەشدا بەند کرا، ئەوەبوو ئەو شوێنەی دۆزییەوە کە دوو ڕۆژی سەرەتای تێدا بەسەر برد. لە سێیەمین ڕۆژدا ئەو پیاوەی قازی لە شاری سمیرناوە ناردبووی توانی بگاتە بەرزترین دەستەڵات و ئاکام جەمیل دەربهێنێت و ژوورێکی تایبەتی لە گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا پێ بدرێت و، خزمەتی باشی بەربکەوێت، تا ئەو کاتەی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت و لە پرسەکەی دەکۆڵرێتەوە. ئەوەیش دەست بەجێ جێبەجێ کرا.

ڕۆژی دواتر قەشە پیتەر لەسەرخۆ هەنگاوی دەناو گۆڕەپانە گەورەکەی ئەم سەرو ئەو سەر کرد وەك بڵێیت بەدوای شتێکدا بگەڕێت یان چاوەڕوانی چاپێکەوتنی یەکێك بکات. بە نیگای لە هەموو پەنجەردو بالکۆنی تەلارەکانی دەورو بەری ورد دەبووەوە. جار ناجار

حاییم لێی نزیك دەبووەوە، پاش ئەوەی شوێنەکەی پێشووی لە ژوورەکە لە تەنیشتنی قەشە پیتەرو هەردوو بازرگانە بولگارییەکەوە بە جێ هێشت و، شوێنێکی گۆشەگیرتری هەڵبژارد. پاساوی بۆ ئەوە هێنایەوە گوایە بای سارد لێی دەدات. بەڵام پاش دوو سێ ڕۆژی دواتر لای قەشە پیتەر بە شێوەیەکی نهێنی دانی بەوەدا نا کە گومانی لەو دوو بازرگانە بولگارییە هەبووەو بڕوای وایە سیخوڕن. قەشە پیتەر پێکەنی و ئەو بیرۆکەیەی دوور خستەوە. لەو کاتەیشدا سەرنجی دایە دەم و چاوە باریکەکەی حاییم، بۆ یەکەمین جار دەربڕینێکی سەیری پێوە بەدی کرد وەك ئەوەی بە دەم و چاوی ئەو کەسانەوە دەبینرێت لەوانەی لە ناخی خۆیاندا لەگەڵ هزرەکانیاندا دەکەونە ململانێ و تێك هەڵچوونەوە، لە کاتێکدا تووشی ترس و تۆقین دەبن.

دوای دوو ڕۆژ حاییم بەسەر شۆڕی گەڕایەوە، لووتە درێژ و باریکەکەی بە گوێی قەشە پیتەرەوە ناو هەواڵی سیخوڕی دیکەی پێ ڕادەگەیاند، ئاگەداریشی دەکردەوە ویرای خۆی بێت.

- حاییم واز لەوە بێنەو لای کەس باسی مەکە.

- دەزانم جگە لە تۆ بۆ کەسم باس نەکردووە.

- بۆ کەسی مەدرکێنە، تەنانەت بۆ منیش. ئەمە کارێکە نابێت قسەی لەبارەوە بکرێت و خۆتی تێ هەڵقورتێنیت.

بەم شێوەیە قەشە پیتەر بەرانبەر بە بڕوای خێراو زۆری حاییم، کە بێزاری کردبوو، بەرگری لە خۆی کرد. وێڕای ئەوەیش ئەو کارە چەند جاری دیکە دووبارە بووەوە، تا قەشە پیتەر لێی ڕاهات. بە شانی (حاییم)یدا دەداو، هێوری دەکردەوە، هەوڵی دەدا جۆرە نەرمییەکی گاڵتەی ئاشتیانەی پێ ببەخشێت.

- بەڵام، کێ؟ ئەو تووك زەرردە درێژە؟ ئەدی نایبینیت لە ترساندا زەندەقی چووەو بایەخ بە هیچ شتێکی دیکە نادات؟ پیاوێکی بێ تاوان و بەستەزمانە، تۆ بێ هیچ هۆیەك گومان لە خەڵکی دەکەیت.

حاییم ساتێك یان دوو سات هێور دەبووەوە، بێ ئەوەی بۆ ماوەیەكی دووررو درێژ بەرگە بگرێت. دەتبینی دووبارە بۆ لای قەشە پیتەر دەگەڕایەوەو دووپاتی دەكردەوە كە جگە لەو بڕوا بە كەسی دیكە ناكات، درێژەی بەو قسانەی دەدا كە پێش كەمێك كردبوونی.

ـ باشە، ئەوەی گومانت لێ كردووە هەڵەی تێدا نییە ـ با بڵێین هەڵەیە ـ باشە، بەڵام هەرگیز ناتوانیت گومان لە كەسێكی دیكە بكەیت . كێیە؟ ئەوەیە لە نزیك دەروازەی سەرەكی ڕاوەستاوەو تەماشای بەردەمی خۆی دەكات و وا دەجوولێتەوە كە گوێ بە هیچ شتێك نەدات؟ یان ئەوەی چەقاوەسووانە تەماشای هەموو مرۆڤێك دەكات هەر لە تەوقی سەریەوە تا پەنجەی پێی؟ یان ئەو ئاشتیخوازەی وا پێدەچێت گەوجترین كەس بێت؟ یان دەشێت هیچ كامیان نەبێت، بەڵكو دەیەمین كەس بێت؟ جا لەبەر ئەوەی تۆ نازانیت كامیانە، هاوكات لەوە دڵنیا نیت كە خۆی نییە، ئەوە دەشێت هەر یەكەیان ئەو بێت. هەر یەكەیان.

ـ حاییم بە ئایینت سوێندت دەدەم لەو شتە دوور بكەوەوە كە هیچ سوودێكی نییە.

قەشە پیتەر ئەوەی گوت لە كاتێكدا ئیدی حەوسەڵەی نەما.

ـ نا، نا! ئێوە برادەری بەڕێز ئێوە مرۆڤێكی باشن. لەبەر ئەوەیە لەو بڕوایەدان كە هەموو كەسێك باشە.

ـ حاییم، برام، باش بیر بكەوە، هیچ شتێك ڕوو نادات شتی باش نەبێت.

ـ نا، باش، باش ؟

حاییم لەكاتێكدا پڕ لە گومان بوو بە گوێوەی چرپاند، كاتێك سەری دانەواندبوو و دوور دەكەوتەوەو چاوی بڕیبووە عەرد.

جارێكی دیكە ڕۆژی دواتر، سەر لە بەیانی زوو دەگەڕایەوە، وەك بڵێیت بۆ ددان پێدانان هاتبێت. تەنانەت ئەو كاتەی بۆ ساتێك لە ترسەكانی خۆی ڕزگار دەبوو ئەو كاتەیش هەر هێور نەدەبووەوە. ئەو كاتە بە دەنگی چالاك كە بەردەوام لەشتێك دەورووژا، دەستی بە قسە دەكردو لەبارەی ئەو زوڵمەوە دەپەیڤی كە لە لایەن خەڵكەوە لێی كراوەو ئەو زیانەی پێی گەیشتووەو لە بارەی ناكاری خەڵكی شارۆچكەكەیەوە دەدوا.

قەشە پیتەر بەردەوام هەڵی دەقۆستەوەو بەردەوام چەند پرسیارێکی لەبارەی جەمیل ئەفەندییەوە لێ دەکرد. حاییم هەرگیز لە بەرسڤدا درێغی نەدەکرد. دەیتوانی جارێکی دیکەو بە دوورو درێژی سەبارەت ئەو شتانە بئاخڤێت کە پێشتر قسەی لەبارەوە کردوون. وردەکاری نوێی بڕوا پێکراوو زۆرتری دەخستنە سەر. قەشە پیتەریش بەوپەڕی بایەخەوە گوێی لەهەموو ئەوە دەگرت و، چاودێری دەم و چاوی باریکەلەو تەوێڵی بەرزی حاییم دەکرد. پێستی ئەو تەوێڵەی توند پێوەی بەندبوو، ناسک تا ڕادەی شەفەفیەت، هەر لۆچێکی ژێرەوەی پیشان دەدا چەندەیش بچووک بێت، هەموو ئێسکەکانی تەوێڵی دەخستە دەر. قژە لوولە سەیرەکەی، کە دەوری ئەو تەوێڵەی دابوو، ئەوەند لوول بوو بە شێوەیەکی نەگونجاوو تەنك وەك بڵێیت گرێکی نەبینراوە لە ڕەگ و ڕیشەوە دەبریقێتەوە.

ئەگەر ڕووی داو حاییم پاش قسەکانی بەسەر شۆڕی و خەفەتبار بڕۆیشتایە ئەوە قەشە پیتەر بە نیگایەکی دوورو درێژ تەماشای دەکردو بەزەیی پێدا دەهاتەوە.

دوو ڕۆژ جەمیل دیار نەبوو یان نەهات. حاییم ـ کە وێڕای هەموو کێشەکانی لە شوێنێکەوە هەموو شتێکی دەزانی یان بە لایەنی کەمەوە بە خۆی دەگەیشتە ئەو ئەنجامە ـ ئەو کارەی وا شی دەکردەوە کە ئێستە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت، بۆیە لەو کاتانەدا ڕێ بە گومان لێکراو نادەن بچێتە گۆڕەپانەکەوە، بۆ ئەوەی پێوەندی بەکەسەوە نەکات، کاتێك لێپرسینەوەکە کۆتایی دێت و، تەواوی پرسەکە ڕەوانەی دادوەر دەکەن، ڕێی دەدەن بە گۆڕەپانەکەدا بسووڕێتەوە.

حاییم هەموو شتێك دەزانێت و پێشبینی هەموو شتێك دەکات (وێڕای ئەوەی بەردەوام ئەوشتانە دروست نەبوون ) ئەو بەیانییە قەشە پیتەر لەسەر بەردێك دانیشتبوو، بیری دەکردەوە بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ گوێی لە ناکۆکییەکی شێت و دەمەقاڵێیەك بوو لە دوو لای جیاوازە دەهاتن، کە دەنگەکان لە گوێیدا تێکەڵ و پێکەڵ دەبوون.

لای چەپیەوە بازنەیەکی بچووك دروست بوو لە هەندێك قومارچی پێك دەهات، وا دەهاتە پێش چاو کە ئەوانە ناکۆکییەکی نێوان خۆیان کۆتایی پێدەهێنا کە پێشتر لەسەر

قومارکردن سەری هەڵدابوو. بازنەکە لە دادگەیەك دەچوو ئەندامەکانی لە چەند پیاوێکی گومان لێکراو پێکهاتبێت و، قسەکانیش ڕەق و وشك بوون.

- پارەی کابرا بدەوە.

یەکێکیان ئەو درێژە بە دەنگێکی نەشازو توند گوتی، وا دەهاتە پێش چاو کە یەکێك لەسەر دەستەی قوماربازەکان بێت.

- ئەمەی بۆ دەگێڕمەوە.

پیاوێکی کورتە بنە کە هەردوو چاوی گریان دەکردەوە، بە ناو لەپی بە قۆڵەنیسکی خۆیدا کێشا، بە تووڕەییەوە هاواری کرد.

- تەماشای بکە چ پیاوێکە و دوایی گەواهی بدەن! پیاوەکەی بریندار کردو ئەوەندەی نەمابوو بیکوژێت.

هەندێك لەم لاو لەو لاوە بەر گوێ کەوتن:

- چ ڕێم لێ دەگرێت نەیکوژم؟

- شتێك هەیە پێی دەڵێن دوورخستنەوە. ئەوە دەزانیت ؟

- با هەبێت! کاتێك دەردەچین دەیکوژم، جارێکی دیکە لە پێناوی ویدا لەسەر یەك لا دەنووم!

چەند دەنگێکی ناڕەزایی بەرز دەبنەوە، بە زەحمەت دەنگی پیاوێکی درێژ دەبیسترێت، پڕ لە هەڕەشەو گوڕەشە، کە بەوپەڕی گەوجێتییەوە گوتی:

- پارەکەی بۆ بگێڕەوە، گوێت لێیە؟.

هەرچی دەمەقاڵێکەی پیاوانی بازنەکەی لای ڕاست بوو گەورەتر بوو. لەماوەی چەند ساتێکدا بەتەواوتی بەسەر ئەو دەنگانەدا زاڵ بوو کە لای چەپەوە بەرز دەبوونەوە. لەنێویاندا سەرکردە بوو، لەگەڵ ئەو پیاوە فرەبێژەی لەشێکی وەرزشیانەی بەهێزی هەیە کە بە دەنگێکی کڕ هاوار دەکات، لەگەڵ بەندکراوێکی نوێی کورتە بالآدا پێیان دەگوت سوفتا. وەك جاران قسەی نێوانیان لەبارەی ئافرەتەوە بوو. سەرکردە هیچ شتێکی نەگوت، بەڵکو خۆی بۆ گێڕانەوەیەکی نوێ ئامادە دەکرد. سۆفتاو وەرشوانەکە ناکۆکییەکەیان بەڕێوە دەبرد.

پیاوێکی کورتە بالاّ هاواری دەکرد بە دەنگیدا دەرکەوت لەکاتی قسەکردندا بازی دەدا، وەك چۆن پیاوە کورتەکان وا ڕەفتار دەکەن بۆ ئەوەی بایەخێکی پتر بە قسەکانیان بدەن.

- ئافرەتانی ئەرمەنی، ئافرەتانی ئەرمەنی، ئەوانە ژنن، ئەوان!

-- چی ئافرەتانی ئەرمەنی؟ کام ئافرەتانی ئەرمەنی؟ تۆ لەبارەی ئافرەتانی ئەرمەنییەوە بۆ من دەدوێیت؟ تۆ ؟ تۆ هێشتە هەرزەیت.

- تەمەنم سی و یەك سالّە.

- مەبەست ئەوە نییە. سالّ گرنگ نییە، بەلّکو تۆ هێشتە هەرزەیت، شیتیت، هێشتە پێنەگەیشتوویت، بە گشتی تۆ هەموو ئەو شتەی کە کەمە.

- تۆ هەرچی هەیە (زۆرە).

پیاوە کورتە بالاّکە ئەمەی بە شێوەیەکی وشك و ناشیرینانە گوت کاتێك هەموو ئەوانی دیکە پێدەکەنین.

- نابینیت تەنانەت لەوەیشدا ڕاستت نەکرد! من لە هەموو ئەوەی هەیە - زۆرترم. دەبێت بزانیت. لەبەر ئەوەیە کە من مرۆڤێکی گوێڕالّ نیم. بەلّێ تەنانەت من گوێڕایەلّ نیم. هەرچی تۆیە، تۆیـ یـ ـە ؟!

لێرەدا دەنگ گڕەکە تەنیا وشەیەکی کورتی گۆکرد پێکەنینێکی گشتی بالّی بەسەردا کێشا کەس لێی نەگەیشت.

جارێکی دیکە دەنگە گڕەکە دەستی پێ کردەوە. جارێکی دیکە دەمەتەقێ لەبارەی ئافرەتان و خۆشویستنی ئافرەتانەوە دەستی پێکرد، وەك بلّێیت نازانێت لەبارەی شتی دیکەوە بدوێت.

- ئەرمەنییەکە، کاکە، چوون ئاگری دارستان وایە: زۆر زەحمەتە هەلّیگیرسێنیت، بەلاّم ئەگەر یەك جار گڕ بگرێت کەس ناتوانێت بیکوژێنێتەوە. ئافرەت نییە بەلّکو - کارێکی زۆرە ملێیە. چارەنووسێکە بە پیاوەوە بنووسێت ئیدی گیرۆدەی خۆی و هەموو خێزانەکەی دەبێت، نەك تەنیا هەر زیندووەکانیان بەلّکو مردووەکانیش، ئەوانەیش هێشتە لەدایك نەبوونە.دەتخۆن. هەموویشی بە هەق و بە یاسا، تەنیا بە هەق و یاسای

خوایی. (هەموویان وشەی خوایان کردووەتە هاوبەش). نەرمەنییەکە هەفتانە شەش ڕۆژ خۆی ناشوات، لەبەر ئەوەی تەنیا ڕۆژانی پشوو خۆی دەشوات. هەر هەموشیان تووکنن هەر لە پەنجەکانیانەوە تا دەگاتە چاویان. بۆنی سیریان لێدێت. هەرچی چەرکەسەکانە!!

ـ ئاه ئافرەتی ڕاستەقینەیە!

یەکێك لەبازنەکە بە هەناسە هەڵکێشانەوە ئەوە دەڵێت.

ـ برادەر ئەو ئافرەتە ڕۆژێکی هاوینانەیە نەك ئافرەت. ڕۆژێکی هاوینانە نازانیت کامیان تێدا جوانە، زەوی یان ئاسمانی سەرەوەی. لێرەدا دەبێت باش خۆت ئامادە بکەیت. هەرچیش بکەیت کەس پشتیوانت نییە، تەنانەت باشترین مامۆستایش دەبینیت توانای ئەوەی نییە. ئافرەتە چەرکەسییەکە باڵندەیەك نییە ئەگەر بیگریت دەبێتە موڵکی تۆ.. نا.شتێکە پیاو ناتوانێت بیکاتە موڵکی خۆی. ئەو ئافرەتە وەك ئاو لەناو لەپت دەخلیسکێ و دەڕژێت کاتێك بتەوێت بیکەیتە هی خۆت هەر دەڵێیت لەژیانی خۆتدا نەبووەتە موڵکی تۆ. لێرەدا یادگە نییەو ئاگەی تێگەیشتن و گیان و بەزەیی لەئارادا نییەو، هەرگیز پەی بە یاساکانی نابەیت.

دووبارە وشەیەکی کورت بەرگوێ کەوت کەس تێی نەگەیشت پێکەنینێکی زۆری نایەوە. قەشە پیتەر هاتەوە لای هزرەکانی و ڕۆیشت لە شوێنێکی کەمێك دوورتر دانیشت. هەستا، بەڵام ئەوەندەی نەبرد لەناکاو ڕاوەستا، ئەوەبوو، جەمیل ئەفەندی بە پەشۆکاویو پاش سڵاوێکی کورت لەبەردەمیدا ڕاوەستا.

زۆر جار ئەمە ڕوو دەدات. ئەوانەی ئارەزوو دەکەین بیانبینین لەو ساتانەدا نایەن کە بیریان لێدەکەینەوەو بەپەڕی چاوەڕوانییەوە ئارەزوو دەکەین بێن، بەڵام لەساتێکدا دەردەکەون کە بەبیرکردنەوە زۆریان لێوە دوورین. بۆیە کارەکە پێویست بە کاتێکی کورت دەکات تا شادبوونمان بە دیتنیان لە ناخەوە، لەو شوێنەوە کە پەستێوراوە دەورووژێت و، جارێکی دیکە بەهۆی ئەم بەیەك گەیشتنەوە سەرهەڵدەداتەوە.

لەهەراو هوریاو پێکەنینەکە دوور کەوتنەوە.

ـ برا، نابینیت؟ نابینیت!

قەشە پیتەر یەکەمین جار ئەمەی گوت و، چەند جارێك دووبارەی کردەوە، وەك بڵێیت خەیاڵ بکات. ئەو وشانەی دووبارە کردنەوە کاتێك هەردووکیان لە تەنیشت یەکدییەوە دانیشتبوون. (ئەو شادییەی هەستی پێدەکرد تا ئەو ڕادەیە نەبوو لە هەموو دڵیەوە بێت).

لەناکاو هەموو شتێك وا هاتە پێش چاو وەك بڵێیت هەر لە مێژە ڕووی دابێت، ئەگەرچی تەنیا چەند ڕۆژێك بە سەر دوایەمین دیداری نێوانیاندا تێپەڕیبوو. لاوەکە بە شێوەیەکی هەست پێکراو لاواز بووبوو، وەك بڵێیت گوشرابێت. بازنەی تاریك پتر لە دەوری چاوی دەرکەوتن و، دەم و چاوی تا دەهات باریکتر دەبوو، بزەیەکی سووکی پێوە دیاربوو وەك بڵێیت لەدەرەوە بەسەریدا پەرچ دەبێتەوە، دەربڕینێکی شەرمنۆکانەو شڵەژاوی پێ دەبەخشی. ساقۆکەی لۆچ و ڕیشی درێژو پشت گوێ خراو، تا ڕادەیەك لاوەکە بە شێوەیەکی گشتی لە پێشان پتر خوددارو ترساوو تۆقیو دەینواند.

وەك بڵێیت ئەو برادەرایەتییە ناناسایییەی لە نێوان لاوێکی تورکی سەر بە خێزانێکی بەڕێزی خەڵکی شاری سمیرنا و کریستیانێکی نەناسراوی خەڵکی بۆسنیا لەو ڕۆژانەدا پەرەی سەند کە تێیاندا بەیەك نەگەیشتن. بەڵکو خێرا پتر لەم بەندیخانە سەیرەدا پەرەی سەندو دووپات بووەوە، ئەویش بە پێچەوانەی ئەوەی کە پێشبینی دەکرا. ئەمەیش ئەو دۆستایەتییەیە کە ناشێت ڕوو بدات تەنیا لەو بارودۆخە تایبەتەدا نەبێت. دەمەتەقێکانی هەنووکەشیان تەنیا گێڕانەوەیەکی لەسەرخۆی ئەو شتانە بوو کە کاتی خۆی بینیبوویان یان خوێندبوویانەوە.بەڵام ئەو دەمەتەقێیانە لە هەموو ئەو شتانەی کە دەشێت لە دەورو بەریان ببینرێن یان ببیسترێن جیاوازتر بوون، ئەمەیش شتە گرنگەکەیە. بە هۆیانەوە تەواوی ئەو ڕۆژەیان لە بەیانییەوە تا ئێوارە بەسەر دەبرد ـ ئەو کاتەی پێویستە هەموو گیراوەکان بچنە ژوورەکانیانەوە ـ ڕاشنەدەوستا ئەو کاتە نەبێت کە جەمیل ناچار بوو بچێت نوێژی نیوەڕۆ یان عەسر بکات. شتێکی ئاسایی بوو قەشە پیتەر زۆرتر قسەی دەکردو دەپەیڤی، لەگەڵ پەرەسەندنی بەشداری کردنی لاوەکە لە دەمەتەقێکەدا بە شێوەیەکی هەست پێنەکراو، وێڕای ئەوەی ئێستەیش دەنگی وەك

دەنگدانەوەیەکی بەرزی دەنگێکی گڕی سنووردار دەبیسترا، ئەوەندەی نەدەبرد پاش چەند وشەیەك وەك جاران دەبووە چرپە.

بەم جۆرە دەنگە، جەمیلی کومدوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان و، لە ساتێکدا،(جارێکی دیکە قەشە پیتەر نەیتوانی بیری بکەوێتەوە ئەو ڕووداوە کەی و چۆن ڕووی دا) دەستی بە قسەکردن لەبارەی مێژووی سوڵتان جەم کردەوە. لەو ساتەوە تا کۆتایی دەربارەی هیچ شتێکی دیکە نەدەدوا.

پاڵنەری دەست پێکردنی قسەکە بە ڕێکەوت بوو، یان بەم شێوەیە دەهاتە پێش چاو. بەدەنگێکی نزم، وەك بلێیت سەبارەت بە شتی ئاسایی دەپەیڤێت، جەمیل پرسی:

ـ ئایە لە مێژوودا چاوت بە ناوی سوڵتان جەم، برای بایەزیدی دووەم نەکەوتووە؟

ـ نا.

قەشە پیتەر لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە، لە کاتێکدا بیری دەکردەوەو قسەکانی پێشووی حاییم دەیانورووژاندو، هەر شوێنەوارێکی سەرسوڕمانی خۆیشی دەرنەدەخست.

ـ نەتانبینی... نەتانبینی؟

پەشۆکاوی لاوەکە بەئاشکرا دیار بوو. پاشان دوای ئەوەی چەند وشەیەکی ڕووتی ناچارانەی وەك پێشەکی گوت، دەستی پێ کردەوە.

# پێنجەمین پار

ئەوە بەسەرهاتی هەمیشەیی هەردوو براکەیە بە شێوە کۆن و نوێیەکەی.

لەو کاتەوە جیهان و ژیان هەبووە ئەم بەسەرهاتە سەرلەنوێ و بەردەوام لەم جیهانەدا نوێ دەبێتەوە. بەسەرهاتی هەردوو برا کێبەرکارەکەیە. یەکێکیان برا گەورەکەیە، کە زیرەکترو بەهێزترو نزیکتر بوو لە جیهان و ژیانی ڕاستەقینەوەو، هەر هەموو ئەو شتانەی پێوەندییان بە خەلکەوە هەیەو پێکەوەیان گرێ دەدات و دەیانبزوێنێت، ئەو پیاوەی دەستی بۆ هەر شتێك بردبایە سەرکەوتنی بەدەست دەهێناو، لەهەر ساتێکدا دەزانێت چ پێویستە بیکات و چ پێویستە نەیکات، چ پێویستە داوای لە خەلکی دیکەو لە خۆی بکات و چ پێویست نییە. هەرچ برا بچووکەکەیە ئەوە بە پێچەوانەوەیە، پیاوێکی بە تەمەن کورت و، بەدەبەخت و، یەکەمین هەنگاو هەلبێنێت هەلە دەکات، مرۆڤێکە ئاواتەکانی بە پێچەوانەی پێویست و لە دەرەوەی توانایدا بەفیڕۆ دەچن، لە ناکۆکی لەگەل برا گەورەکەیدا، لێرەیشدا ناکۆکییەکە هیچ چارەیەکی نییە، هەر لەسەرەتاوە دەدۆڕێت.

هەردوو برا ڕوو بە ڕووی یەکدی ڕاوەستان کاتێك باوکیان سولتان (فاتح محەمەدی دووەم) ڕۆژێك لە ڕۆژانی مانگی ئایاری سالی ١٤٨١ ز لەیەکێك لەشەڕەکانیدا مرد. ئەو کاتە برا گەورەکە بایەزید تەمەنی سی و چوار سالانەی تەواو کردبوو، برا بچووکەکەیش جەم هێشتە تازە پێی دەنایە تەمەنی بیست و چوار سالییەوە. بایەزید فەرماkداری ئەماسیا بوو کە مەلبەندەکەی دەریای ڕەشە. جەمیش فەرمانداری کەرەمانیا بوو لە قۆنیە. بایەزید گەنم ڕەنگ و، کەلەگەت و کەمێك پشت کۆماوە بوو، سنگ فرەوان و، ئارەزووی لە بێدەنگی دەکرد. جەمیش زەبەلاحێك بوو، تووك زەرد و، بە قەلافەت، نیگەران و سەرکێش بوو. ئەگەرچی جەم لاو بوو بەلام لە کۆشکەکەی خۆی لە قۆنیە بازنەیەك لە زانایان و شاعیرو میوزیکژەنانی

پێکەوەنابوو. بە خۆیشی شیعری باشی دەنووسی. وێڕای ئەوەیش مەلەوانێکی لێهاتوو و وەرزشوان و ڕاوچی بوو. (وەك دەڵێت سەرێکی پێگەیشتوو بوو). زانین و ئارەزووەکانی بێ سنوور بوون، تا ڕادەیەك ڕۆژ بۆ ئەو کورت بوو، بۆیە تا بۆی بکرایە هەندێك کاتی لە شەوو لە خەو وەردەگرت تا ڕۆژەکەی پێ درێژ بکاتەوە. یۆنانی دەزانی و بەئیتالیش شتی دەخوێندەوە.

بایەزید یەکێك لەوانە بوو کە بە دەگمەن خەڵك قسەیان لەبارەوە دەکرد، هاوسەنگ بوو، ئازابوو، لەتیرهاویشتن و شەڕدا شارەزاو لێزان بوو. نەك تەنیا کوڕە گەورەو شارەزاتر بوو، بەڵکو شارەزای کاروباری ئەمپراتۆریەتە گەورەکەی باوکی بوو، شارەزای یاساو ڕێ و ڕەسمەکانی بوو، شارەزای سەرچاوەکانی داهات و پێوەندییەکانی لەگەڵ جیهانی دیکەدا بوو. لەو کەسانە بوو کە بیریان لە یەك شت دەکردەوەو لە هەموو ساتێك لە ساتەکانی ڕۆژدا یەك شتیان دەکرد، شتێك کە گرنگ و زۆر پێویست و سوودمەندتر بوو.

لە کێبەرکێ بۆ پڕ کردنەوەو دانیشتنە سەر تەختی پاشایەتی بایەزید خێراترو لێزانتر بوو. (جەم)یش ژمارەیەك لایەنگری لە کۆشك و لە سوپادا هەبوو (هەموویان دەیانزانی سوڵتان محەمەد فاتح بەخۆی پێی باشترە کوڕە بچووکەکەی شوێنی بگرێتەوە). بەڵام پیاوانی بایەزید ڕێك و پێکترو یەکگرتووتر بوون، زووتر بە خۆیان کەوتن. بایەزید یەکەم کەس گەیشتە ئەستەنبوڵ و دەستەڵاتی داگیرکرد. یەکسەر دەستی بە ئامادەکردنی سوپا کرد دژ بە براکەی کە ئەویش لەگەڵ سوپاکەیدا بوو لە کرمانیاوە بەرەو ئەستەنبوڵ دەهات.

سوپای جەم بە سەرکردایەتی کدیك پاشا گەیشتە بۆرسە، مەڵبەندی هەمیشەیی عوسمانلی. شارێکی سەوزی جوانە، کەوتووەتە نشێوەکانی چەند چیایەکی بەرزەوە، خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. سوپای بایەزید بە سەرۆکایەتی ئەیاس پاشا لە پێدەشتەکە ڕاوەستابوو. گفت و گۆ دەستی پێکرد. هەر براو چەندین بەڵگەی بە دەستەوە بوو کە ماف و شایستەیی ئەوی دەسەلماند، بایەزید پترو زۆرتر سەقامگیر بوو، پێشوازی لێکراو وەك فەرمانڕەوا لەئەستەنبوڵ ددانی پێدانرا. (جەم) مافەکانی خۆی لەسەر بەڵگەی دیکە دامەزراند. بایەزید لە سەردەمی فەرمانڕەوایی باپیرەیان موورادی دووەم لەدایك بووبوو، ئەو کاتەی باوکیان تەنیا جێنشین بوو کە لە دایکێك بوو لە بنەڕەتدا کەنیزە بوو. (جەم)یش ئەو کاتە لەدایك بوو کە

محەمەدی دووەم کە باوکی بوو، چووە سەر تەخت و بوو بە سولتان، دایکیشی سەر بە خێزانێکی میرانی سێربیا بوو. سولتان محەمەد لە ژیانیدا نەیدەگوت دوای خۆی تەختی پاشایەتی بۆ کوڕە بچووکەکەیەتی، بەڵکو دەیگوت کوڕە بچووکەکەی لێوەی نزیکەو، لە دڵی خۆیدا تەختی پاشایەتی بۆ وی دانابوو. بۆیە توانای پاشاکان کە گوێڕایەڵێکی ڕاستگۆیانە یان ئامانجی خۆویستی هەردوو براکەی ورووژاندبوو و دژ بە یەکی هەڵنابوون. وەك چۆن هەندێك جار ڕوو دەدات هەردوو براکە لەهەموو ئەوەی لە دەورو بەریان بوو ئارەزوو و سووربوون و بڕوابوونی تەواوەتی بە ماف و بە توانایان بۆ دووپات کرابووەوە.

لەم بارودۆخەیشدا گفت و گۆکان هیچ ئاکامێکیان لێنەکەوتەوە. جەم داوای بەشی خۆی لە دەستەڵات و سەڵتەنەت لە ئاسیا دەکرد، بەڵام بەرسڤی بایەزید ئەوەبوو کە دەستەڵات و سەڵتەنەت یەکەو قابیلی دابەش بوون نییە. داوای لە براکەی کرد لەگەڵ ژن و کەنیزەکاندا بۆ قودس بکشێتەوەو لەوێ بە ئاسوودەیی ژیان بگوزەرێنێت بەو بڕە پارە زۆرەی کە ساڵانە بۆی ڕەوانە دەکات. بەڵام جەم ئارەزووی ئەوەی نەکرد تەنانەت گوێ لەو قسانە بگرێت. شەڕ بەرپابوو. پێشتر بایەزید توانیبووی یەکێك لەپیاوەکانی خۆی کە یەعقووب بەگ بوو بنێرێتە ڕیزی ڕاوێژکارەکانی جەم. بەم شێوەیە جەم شەڕی دۆڕاندو، زۆر زەحمەت توانی سەری خۆی قوتار بکات و بەرەو میسر ڕابکات، لەوێ والی میسر پێشوازییەکی گەرمی لێکرد، کە هەڵگیرسانی شەڕی نێوان هەردوو براکە وەك دیارییەك بوو لە ئاسمانەوە بۆی ڕەوانە کرابێت. جەم تێکۆشا بە یارمەتی والی میسر جارێکی دیکە بەختی خۆی تاقی بکاتەوە، بەڵام دووبارە شکستی خوارد، لەکەنارەکانی ئاسیای بچووکدا خۆی تاك و تەنیا و بێ سوپا بینییەوە، تەنیا چەند کەسێکی زۆر کەمی دڵسۆزەکانی نەبێت (ژنەکەی و دایکی لەگەڵ سێ منداڵی خوارووی تەمەن هەژدە ساڵی لە میسر مابوونەوە). بەم شێوەیە، جەم لەبەر ئەوەی هەستی بە شکستی کردو زانی چی لێ دەکرێت ئەگەر دەستگیر بکرێت، بڕیاری دا هەڵبێت و خۆی بگەیەنێتە دوورگەی ڕۆد بۆ ئەوەی لەوێ لە دەستەڵاتی کریستیان داوای پەنابەری بکات.

دوورگەی ڕۆد کە بەر لەچەند ساڵێك محەمەدی دووەم گەمارۆی دابوو، لە لایەن یەکێك لە ئایینزا کاسۆلیکییە بەهێزەکانەوە کە ناوی جوانیتا بوو لەگەڵ میرەکانی قودسدا بەڕێوە

دەبرا، ئەوانەی پێڕەوی ئایینزای یۆحنای پیرۆزیان دەکرد. بە مەڵبەندێکی لایەنگرو دڵسۆزی جیهانی ڕۆژئاوای کریستیان دادەنراو لەوێ ناوباگی هەبوو. جەم ئەو میرانەی پێشتر دەناسی کاتێك بە فەرمانی باوکی کە سوڵتان بوو گوفت و گۆی لەگەڵ کردبوون. داوای لێ کردبوون و تکای لێ کردبوون بە پەناهەندەی پەسەند بکەن. لەبەر ئەوەی چاوەڕێی ئەو شتەیان لێ دەکرد یەکسەر کەشتییەکی تایبەتیان بۆ ڕەوانە کرد لە کەنارەوە لەگەڵ دەست و پێوندەکەیدا کە نزیکەی سی کەس دەبوون هەڵیگرتن و ڕاستەوخۆ بۆ دوورگەی ڕۆدی گواستنەوە.

ئەم شۆڕشگێڕەی ململانێی لەسەر تەخت دەکرد، لەلایەن مامۆستای گەورە، نوێنەری ئایینزای میرەکان د. ئۆبیسۆن (پییێر د. ئۆبیسۆن)ەوە بەڵکو لەلایەن هەموو گەلەوە بە شێوەیەکی فەرمی پاشایانە پێشوازی لێکرا. مامۆستای گەورە دابینکردنی ئازادی و پەنابەریەتی سیاسی بۆ (جەم) دووپات کردەوە. لەسەر ئەوەیش ڕێککەون کە جەم فەرەنسا وەك نیشتمانێك بۆ خۆی هەڵبژێرێت تا لەوێ بژیت، تا بەخت دەبێتە یاری و وەك سوڵتان بۆ تورکیا دەگەڕێتەوە. بەم شێوەیە جەم لەگەڵ پاسەوان و دەست و پێوەندەکەیدا ڕەوانەی فەرەنسا کران. ئیدی د. ئۆبیسیۆن لەهەموو تەوەرو لایەکەوە دەکۆشا بە هۆی ئەم میرە بەدبەختەوە باشترین سوود بۆ بەرژەوەندی چین و ئایینزاکەی و، بۆ کریستیان بە گشتی، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەدەست بهێنێت. زۆری لا ڕوون بوو ئەوەی لە ژێر دەستیدایە چ بارمتەیەکە. کاتێك جەم گەیشتە فەرەنسا، بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنانەی پێی درابوون، لە شاری دژواری سەر بە چینی میرەکانی قودس، ئازادی پێنەدرا بەڵکو دەست بەسەر کرا.

سەبارەت بە (برای سوڵتان) چەند پیلانی چەپەڵ هۆنرانەوەو، چەندین حسێبی بێ شومار خرانە ڕوو هەموو حکومەتەکانی ئەو کاتەی ئەوروپا بەشدارییان تێدا کرد: لەگەڵ پاپاو، بگرە خودی سوڵتان بایەزید. بەم شێوەیە پاشای هەنگاریا ماتیا کۆڤین و پاپا ئینۆی کنیتای حەوتەم ئارەزوویان کرد (جەم)یان تەسلیم بکرێت بۆ ئەوەی لە شەڕی دژ بە تورکیا و بایەزیدی دووەم بەکار بهێنرێت. بەڵام د. پییێر ئۆبیسۆنی نامەرد ئەو بەندە بە بەهایەی لای خۆی گل دایەوەو، بە هۆیەوەو بە شێوەیەکی فێڵبازانە دەستی بە هەڕەشە لە هەموو لایەك کرد. هەڕەشە لە بایەزیدو سوڵتانی میسرو پاپا. بایەزید بە

ڕواڵەت بڕە پارەیەکی زۆری پێ دەدا بۆ خەرجی جەم، لە ڕاستیشدا بۆ ئەوە بوو لای خۆی گلی بداتەوە تەسلیمی کەسانی دیکەی نەکات. پاپا بەڵێنی بە پییێر د. ئۆبیسیۆن دابوو پایەی کاردینالی پێ ببەخشێت ئەگەر (جەم)ی تەسلیم بکات. سوڵتانی میسرییش بەڵێنی پێ دا بڕە پارەیەکی زۆری پێ ببەخشێت. دایکی بەدەبەختی (جەم) کە لە میسر دەژیا هەر دەکۆشا کوڕەکەی ئازاد بکرێت، پارەیەکی زۆری بۆ جەم ڕەوانە دەکرد. بەڵام هەموو ئەو بڕە پارەیە لای مامۆستای گەورە دەمایەوە.

گەلەکۆمەکێ بۆ سەر برای سوڵتان و، یارییە وردەکەی د. ئۆبیسیۆن هەشت ساڵی ڕەبەقی خایاند. لەو ماوە زۆرەیشدا (جەم)یان لە شارێکی فەرەنسی توند پارێزراوەوە بۆ شارێکی دیکە دەبرد، ئەوەیش بەردەوام لەژێر پاسەوانییەکی توندو تۆڵی میرەکانی قودسدا. وردە وردەیش پاسەوان و دەست و پێوەندەکانیان لێ دوور دەخستەوە، تا لە ئاکامدا تەنیا چوار ـ پێنج پیاو لە دەست و پێوەندەکانی مانەوە. هەموو هەوڵەکانی هەڵاتن و خۆقوتارکردن لە دەستی میرە خوانەناسەکانی قودس شکستیان هێنا. سوڵتان بایەزیدیش هەرچی لە توانادا بوو درێغی نەکرد بۆ ئەوەی خۆی لەو پاڵەپەستۆیە قوتار بکات کە جیهانی کریستیان بە هۆی برا بەدبەختەکەیەوە دەیانکردە سەری، ئەو برایەی بوو بوو بە هۆکارێك بەدەستی ئەو جیهانەوە. لە شاکانی دوبرۆفینك و شاکانی ناپولی هەواڵی براکەی دەپرسی و پێوەندییەکانیشی لەگەڵ پییێر د. ئۆبیسیۆندا درێژە پێ دەداو لەبەردەمیدا چەندین پاشەکشەی گەورەی هەمە جۆری پیشان دەدا. وێڕای هەموو ئەوەیش بە شێوەیەك لە شێوەکان بەرژەوەندییان بە پێچەوانەی یەکدییەوە بوو. د. ئۆبیسیۆن ئارەزووی ئەوەبوو بۆ درێژترین ماوە جەم لە ژێر دەستەڵاتی خۆیدا گل بداتەوە تا بە هۆیەوە هەڕەشە لە هەر هەموو جیهان بکات. گرنگ بە لای بایەزیدەوە ئەوە بوو براکەی ـ ڕەکەبەرەکی لە بەندیخانەیەکی ئەمیندا بێت نەك سەرۆکایەتی سوپایەك بکات و هێرش بۆ تورکیا بهێنێت.

لە هەشتەمین ساڵی ئاکنجیبوونی جەم لە فەرەنسا، ساڵی ١٤٨٨ شەڕی دیپلۆماسی لەمەڕ کەسایەتی جەم گەیشتە لووتکە، ئەوەبوو نوێنەران لە هەموو لایەکەوە گەیشتنە

پاریس، هەر هەموویان یەك ئەركیان هەبوو ئەویش: كەسایەتی جەم بوو. نوێنەری بایەزید كابرایەكی یۆنانی كریستیان بوو ناوی ئەنتۆنیۆ ریریكۆ بوو، بۆ پاشای فەرەنسا و پیاوەكانی كۆشكەكەی پێشنیاری كرد بە نهێنی پارەیەكی زۆریان پێ ببەخشێت و بە ئاشكرایش پێشنیاری كرد دەستەڵاتیان لە قودس هەبێت كاتێك بایەزید بەسەر سوڵتانی میسردا سەردەكەوێت و ئەو شارە دەكاتەوە، پێشنیاری كرد دیاری بەهادار بە ئافرەت و پیاوانی كۆشك پێشكەش بكات، ئەو دیارییانەی ئارەزووی دەكەن. هاوكات پاشای هەنگاریا ماتیا كۆرڤین شاندێكی پایەبەرزی نارد داوای دەكرد برای سوڵتانی تەسلیم بكەن، ئەویش لەبەر ئەوەی دەستی باڵاترە ئەگەر هێرش بكاتە سەر بایەزید. گرنگترین شاندیش شاندی پاپا ئینۆ كۆنتیای هەشتەم بوو كە وێڕای بەنێو ساڵداچوون و نەخۆشییەكەی وازی لە مەبەستەكانی خۆی نەدەهێنا كە ئەویش هاندانی فەرمانڕەوا كریستیانەكان بوو شەڕی خاچپەرستی دژ بە توركیا دەست پێ بكەن. بۆیە پێویستی بەوە بوو برای سوڵتان لای ئەو بێت، سوڵتانی یاخی لای ئەو بێت بۆ ئەوەی وەك فاكتەرێك بەكاری بهێنێت.

بەڵام مامۆستای گەورە لە دوورگەی ڕۆد بەردەوام ئامانجەكانی خۆی تێدەپەڕاند. توانی ڕای خۆی بەسەر پاشای فەرەنسادا بسەپێنێت: جەم تەسلیم بەپاپا بكات. لە مانگی شوباتی ١٤٨٩دا جەم لەگەڵ چەند كەسێك لە دەست و پێوەندەكانیدا سواری بەلەمێك دەكرێن و بەرەو تۆلۆن دەبرێن، پاش گەشتێكی دوورو درێژو دژوار دەگەنە تسڤیتا ڤیكیا، لەوێ شاندێكی گەورەی پاپا چاوەڕوانیان دەبێت. جەم كە دەچێتە ڕۆماوە ژمارەیەكی باش دەست و پێوەندی لەگەڵ دەبێت و، كاردیناڵ و هەموو پیاوانی كۆشكی پاپا شان بە شانی نوێنەرانی دیپلۆماسی پێشوازی لێدەكەن. جەم و هەموو دەست و پێوەندەكانی جل و بەرگی ڕۆژهەڵاتی جوان درواویان لەبەر دەبێت و سواری ئەسپی ڕەسەن دەبن. بۆ ڕۆژی دواتر پاپا لە هۆڵی پێشوازی تایبەت بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازی لە میری تورك دەكات كە لەمێژ بوو چاوەڕێیان دەكرد. جەم وەك خەڵكی دیكە سەری بۆ پاپا دانەنەواند بەڵكو دەستیان لە ملی یەكدیی كرد وەك بڵێیت دوو نەیاری هاوسەنگ بن و، فەرمانڕەوا بەرانبەر بە فەرمانڕەوا بن.

پییێر د. ئۆبیسیۆن بوو بە کاردینال. نەك هەر ددان بەچینەکەیدا نرا، بەڵکو زۆر سوودی ڕاستەقینەو دەستکەوتی گەورەیان لەلایەن پاپاوە بۆ دەستەبەر بوو.

پاش چەند ڕۆژێکی دیکە پاپا لە هۆڵی تایبەتی خۆی پێشوازی لە جەم کرد. لەوێ بە ڕاشکاوی و ڕوو والآیی قسەیان کرد. جەم ڕایگەیاند کە میرەکانی دوورگەی ڕۆد فریویان داو تا هەنووکە لە دەست بەسەریدا هێشتبوویانەوە. تکای لە پاپا کرد ڕێی بدات بچێتە میسر، کە دایکی و خێزانەکەی لەوێن. قسەکانی جەم هەڵچوونیان پێوە دیار بوو تا ڕادەیەك فرمێسك زاییە هەردوو چاوی پاپا کە بە وشەی جوان و ناسك دڵی جەمی دایەوە، بەڵام هەر ئەو شتە لەسنووری قسە بەو لاوە تێنەپەڕی. بۆیە یاری گەورەی دیپلۆماسی لە دەوری جەم بەردەوام بوو بگرە توندتر بوو. ئەو کات پاپا هەڵمەتێکی بۆ پێکهێنانی بەرەیەك لە پاشایانی کریستیان دژ بە تورکیا ڕاگەیاند. گریمانەی ئەوەی کردبوو جەم لەو هەڵمەتە خاچپەرستییەدا ڕۆڵێکی گرنگ بگێڕێت، فاتیکان قەفەسی زێڕینی وی بوو. ماتیا کۆڤین داوای تەسلیم کردنی (جەم)ی دەکرد بۆ ئەو هەڵمەتەی بۆ سەر تورکیا بەدەستیەوە بوو. والی میسریش هەمان هەنگاوی نا، پێشنیاری کرد بڕی شەش سەد هەزار لیرەی زێڕین بەرانبەر بەتسلیم کردنی جەم دەدات، جگە بڕی شەش سەد هەزاری دیکە لە لایەن دایکی (جەم)ەوە ئەگەر کوڕەکەیان تەسلیم بکرێتەوە.

ساڵی ١٤٩٠ ماتیا کۆڤین مرد. مردنی ئەو گورزێکی کوشندە بوو لە بیرۆکەی هەڵمەتی گشتی کریستی دژ بە بایەزید وەشێنرا. کاتێك بایەزید زانی جەم کەوتووەتە ژێر دەستەڵاتی پاپاوە، نوێنەری تایبەتی خۆی ڕەوانەی ڕۆما کردو پاپا لە هۆڵی پێشوازییەکان پێشوازی لێکرد، لەوێ هەموو درۆو دەلەسەکانی د. ئۆبیسیۆن ئاشکرابوون و دەرکەوت چەندین بڕە پارەی لە بایەزید وەرگرتووە، بایەزید داوای کرد پاپا جەم لای خۆی گل بداتەوە بەهەمان ئەو مەرجانەی کە میرەکانی دوورگەی ڕۆد گلیان دابووەوە، واتە لەگەڵ هەندێك پاشگەزبوونەوەی سیاسیانەداو بڕی چل هەزار لیرەی زێڕین لە ساڵێکدا. تەنانەت دەتوانێت سەدو بیست هەزار لیرەی زێڕین بۆ سێ ساڵ بە پێشەکی بدات، نوێنەرەکە فەرمانی ئەوەیشی پێبوو بە خۆی جەم ببینێت و لەوە دڵنیا بێت کە هێشتە زیندووەو بەڕاستی لە ڕۆمایە. جەم قایل بوو چاوی بە

نوێنەرەکـە بکـەوێت، بـەڵام وەك سـوڵتان، لەگـەڵ ڕێ و ڕەسمـی تـەواودا. لەسـەر تـەختێکی تایبەتی قاچ لەسەر قاچ دانیشت، یاوەرەکانی لەدوری بوون، کاردیناڵێـك لەتەنیـشتیەوە بـوو. نوێنەرەکە لەبەردەم جەم ـ سـوڵتاندا دانووشـتایەوە، نامەیـەك و دیـاری پێـشکەش کـرد کـە براکەی بۆی ناردبوو. نامەکەی نزیك بە گوێی (جـەم) خوێنـدەوە، بـێ ئـەوەی جـەم تەماشـای دیارییەکان بکات، دانیە دەستی یاوەرەکانی تا لەنێوان خۆیاندا بیبەشنەوە.

پاپا ئینۆ کنیتای هەشتەم لە هەوڵی خۆی بـۆ دامەزرانـدنی بەرەیـەك دژ بـە تورکیـا کۆڵی نەدا. بایەزید پلانەکانی خۆی دژ بە هەنگاریاو ڤینیسیا جێبەجێ کرد. کەسـایەتی جەم لەو چوارچێوەیەدا ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا. سوڵتان (ئەو نێزەیە)ی بۆ پاپا ڕەوانە کـرد کە (کریست ـ یان لەسەر خاچ پـێ برینـدار کـرد)، لەگـەڵ هەنـدێك لـەپاشماوەی ئێـسکە بەنرخەکانی، تەنیا داوای یەك شتی لێکرد: جەم بە دیلی لای خۆی گل بداتەوەو، تەسلیم بە هیچ کەسێکی دیکەی نـەکات. پاپـایش داوای لـە بایەزیـد کـرد هێـرش نەکاتـە سـەر نیشتمانی کریستیانەکان. ئەگەر ئەو شتە ڕووی دا، ئەو کات سوود لـە جـەم وەردەگرێـت و، دەیکاتە سەرکردەی هەڵمەتی گەورە دژ بە تورکیا.

لەو ماوەیەدا پاپا ئینۆ کنیتای هەشتەم مرد. لـە مـاوەی هەڵبـژاردنی پاپـای نوێـدا جەم لە قەڵای ئانجل بەند کرا نەوەك ڕابکات. کاردینـاڵی هەنووکـە ڕۆدریکـۆ بۆرجیـا بـە پاپای نوێ هەڵبژێررا، کە بە پاپا ئەسکەندەری شەشەم ناسراوە. وا پێدەچوو سەردەمێکی باشتر چاوەڕێی سوڵتانی ڕانەگەیەنراوی ئەمپراتۆریەتی تورك دەکات. ئەوەبوو پێوەنـدی و دۆستایەتی لەگەڵ کوڕەکـانی پاپـادا بەسـتبوو، ئازادانـەتر دەجووڵایـەوەو، بەشـداری لـە ئاهەنگەکاندا کرد. کەسـایەتی جەم لە مێژووی ڕووداوو نامەو وێنەو تابلۆی هونەرمەنـدە نوێیەکاندا بەرچاو دەکەوت، وەك بڵێیت لەتەمەنی سی ساڵیدا بێت و چلی تێپەڕانـدبێت: قەڵەوتر، ڕوو تاریك، پێڵووی چەپی تەواو هاتبووە خـوارەوە، بـەم شـێوەیە دەبینـرا (وەك پیاوێك تفەنگی گرتبێتە نیشانێك)، داهێـزراو، بەرانبـەر بـە خزمـەتکارو بەردەستەکان ئالۆزو تونـد، گـیرۆدەی ئارەزووەکـانی خـۆی بووبـوو، بەتایبـەتی خواردنـەوە، کـە تێیـدا عەوداڵی خەوو بیرچوونەوە بوو بوو.

لەو ماوەیەد ڕوو بە ڕووبوونەوەو پێکدادانێکی نوێ و گەورە لە نێوان فەرمانڕەوا کریستیانەکانی ڕۆژئاوادا ڕووی دا. ئەوەبوو شای لاوی فەرەنسا کارلۆی هەشتەم بە سوپاوە هێرشی کردە سەر ئیتالیا بۆ ئەوەی مەملەکەتی ناپولی داگیر بکات کە بە خاکی خۆی دەزانی. بەخۆی دووپاتی کردبووەوە لەوێوە سەرکردایەتی سوپای بەرەی کریستیان لە شەڕی خاچپەرستی دژ بە تورکیا دەکات. پاپایش هەوڵ دەدات چی لەدەست بێت بیکات بۆئەوەی هێرشەکە ڕابگرێت و نەهێڵێت بێتە ناو خاکی ئیتالیاوە. لەو ماوەیەدا ئەسکەندەری چوارەم وتووێژ لەگەڵ بایەزیددا ئەنجام دەدات، تەنانەت داوای یارمەتی لێ دەکات دژ بە شای فەرەنساو بایەزید، ئەو برە پارەیەی بۆ ڕەوانە دەکات کە لەسەری ڕێککوتوون ئەویش چل هەزار لیرەی زێڕینە کە لە ڤینیسیا لێدراوە، بۆ ئەوەی ببێتە خەرجی ساڵانەی جەم. لە نامەیەکی تایبەتدا پێشنیاری کردووە سێ سەد هەزار لیرەی زێڕین بەرانبەر بە تەسلیم کردنی تەرمی جەم پێشکەش بکات. دوژمنانی پاپا لە ئیتالیا توانییان دەست بەسەر ئەو نامەیەدا بگرن و، دواتر بۆ ڕای گشتییان بڵاو کردەوە.

کارلۆی دووەم دەچێتە ناو ئیتالیاوەو، وڵات دوای وڵات دەکاتەوە. لە دوایەمین ڕۆژی ساڵی ١٤٩٤دا دەچێتە ناو ڕۆماوە. هیچ شتێك لەبەردەم پاپادا نەمایەوە ئەوە نەبێت بە کەمترین زیان و وێرانکاری لەگەڵ داگیرکارە لاوەکەدا لێك بگەن. یەکێك لە داواکانی کارلۆ ئەوەبوو کە براکەی سوڵتانی تەسلیم بکات، کە ئەویش بەنیازە لە شەڕی دژ بە بایەزیددا سوودی لێوەربگرێت. لەسەر ئەوە ڕێك کوتن کە کارلۆ لە هێرشەکەیدا بۆ سەر ناپولی جەم لەگەڵ خۆیدا ببات، دواتریش دژ بە تورکیا. بەڵام پاپا داوای لە شای فەرەنسا کرد کە گەرەنتییەکی دووپاتکراوەی پێ بدات لە کۆتایی جەنگدا دیلە گرانبەهاکەی بۆ بگێڕێتەوە. ڕێککەوتننامەیەکی تایبەتی لەگەڵ مۆرکرد چل هەزار لیرە زێڕینەکەی بۆ بێنێتەوە کە سوڵتان لە ئایندەدا بۆی ڕەوانە دەکات.

پاپا لە هۆڵی پێشوازییەکاندا بەرانبەر بە شایەتێکی زۆرو دەست و پێوەندەکەی کە ژمارەیان کەم بوو (جەم)ی تەسلیم بە شای فەرەنسا کرد. کاتێك پاپا ئەو بڕیارەی خۆی بە جەم ڕاگەیاند، جەم زانی کە ئەو دیلەو، بەلای ئەوەوە گرنگ نییە لای کێ دیل بێت، چ پاپا یان شای فەرەنسا بێت.

پاپا به وشەی شیرین ویستی گومانەکانی جەم برەوێنێتەوەو هێوری بکاتەوە. کارلۆی هەشتەم بەرانبەری نەرم و نیان بوو، وا مامەڵەی لەگەڵ کرد کە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەیە.

کاتێک کارلۆ بەرەو بەرەنگاربوونەوەی شاری ناپولی بەڕێ کەوت جەم و دەست و پێوەندەکەیشی لەگەڵ خۆی برد، جیزاری کوڕی پاپاشیان لەگەڵ خۆیان برد، کە کاردینالێکی خەلکی ڤینیسیا بوو، ئەویش وەك بارمتە. بەڵام جیزاری بەدرەوشت لە ڕێگە هەڵات. جەمیش نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکەی زۆری نەخایاند چەند ڕۆژێك نەبێت، ئەوەبوو لە کابری مرد بەر لەوەی بگەنە ناپۆلی. پیاوەکانی خۆی ڕاسپاردبوو لەوانەی هەموو ساڵانی دیلێتییان بەسەر بردبوو هەرچۆنێك بووە تەرمەکەی بۆ تورکیا بگوێزنەوە، بۆ ئەوەی خوانەناسان بە مردوویی سوودی لێ نەبینن. بە زار  نامەیەکی بۆ بایەزیدی برای پێ گوتبوون تکای تێدا کردبوو ڕێ بە خێزانەکەی بدات بۆ ئەستەنبوڵ بگەڕێتەوەو، بەزەیی بەو کەسانەیشدا بێتەوە کە ماوەی دوورو درێژی دیلیەتییان لەگەڵ بەسەر بردووە.

کارلۆی هەشتەم فەرمانی دا لاشەی جەم مۆمیا بکرێت و، لەناو سندووقێکی خۆڵەمیشیدا دانرێت. یەکسەر هەواڵێك بلاو بووەوە کە پاپا ژەهری دەرخواردی (جەم) داوەو، بە ژەهراوی تەسلیمی شای کردووە. ئەنجوومەنی شوورای ڤینیسیا یەکسەر هەواڵی مردنی (جەم)ی بە بایەزید ڕاگەیاند، ئارەزووی دەکرد یەکەمین لایەن بێت ئەو هەواڵە خۆشە بە سوڵتانی بەتوانا ڕابگەیەنێت.

هەڵمەتەکەی کارلۆی هەشتەم ئاکامێکی خراپی لێکەوتەوە، کارلۆ بۆ فەرەنسا زڤڕییەوە، پاش ماوەیەکی کورت مرد. لاشەی جەم لای شای ناپولی مایەوە. زۆر وت و وێژو نامە سەبارەت بە لاشەی جەم ئاڵ و گۆڕ کرا. شای ناپولی پارەیەکی زۆری لە بایەزید وەرگرت و پاپا ئەسکەندەری شەشەمیش داوای بەشەکەی خۆی دەکرد. لاشەی ئەو مردووە خزمەتێکی باشی پێگەیاند لە سازدانی ڕێککەوتنێکی زۆر گونجاو لەگەڵ سوڵتاندا. لە مانگی ئەیلوولی ١٤٩٩دا ئاکام لاشە ساردو سڕەکەیان تەسلیم بە بایەزید کردەوە، کە لە ڕێ و ڕەسمێکی جەنازەییدا لە گۆڕستانی بۆرسە ئاشتی، لەو شوێنەی فەرمانداڕانی تورك دەنێژرێن.

***

# شەشەمین پار

قەشە پیتەر لە چوارچێوەی ئەو بەسەرهاتەوە ناوی شاری بیانی و پیاوانی بەتوانای جیهان، سوڵتان، پاشا، پاپا، میرو کاردینالی بیست، کە لە تەمەنی خۆیدا ئەو ناوانەی نەبیستبوو، بەبایەخەوە گوێی دابووە گۆڕان و جم و جووڵەکانی ژیانی سەیرو سەمەرەی (جەم)ی سوڵتان. نەیدەتوانی هەر هەموو ئەو ناوانە ئەزبەر بکات یان دووبارەیان بکاتەوە. زۆر جار لە کاتی بیستندا ئەو دەزووەی بزر دەکرد کە قسەکانی لاوەکەیان پێکەوە گرێ دەدا، تەنانەت وای لێهات لەو بەسەرهاتە نەیدەزانی کێ خزمی کێیەو، کێ فریوی کێی داوە یان کێ کڕیویەتی یان فرۆشتوویەتی. تەنانەت کاتێك لاوەکە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە ڕادوەستا، پیتەر بیری لە بەدبەختی خۆی دەکردەوەو، ئەو کات وا دەجووڵایەوە وەك ئەوەی گوێ ڕادێنێت و خەفەت بۆ ئەو پیاوە بخوات کە ڕوون و دیار بوو بەلایەوە خۆشەویستە بۆیە هەوڵی دەدا هەموو شتێك بە وردی تا کۆتایی بگێڕێتەوە.

لەو بەسەرهاتەدا چەند شوێنێك هەبوون هەموویان جێی تێگەیشتن نەبوون، وەك شیعرەکانی جەمیل لەبارەی چارەنووس، لەبارەی مەی و سەرخۆشی، لەبارەی منداڵان و کیژانی جوان؛ ئەو شیعرانەی جەمیل ئەزبەر دەیخوێندنەوە وەك بڵێیت شیعری خۆی بن. چەند وشەی توندو هزر هەبوون سەری لێ سوڕدەمان و پەشێوی دەکردن کە بریتی بوون لە بۆچوونەکانی جەمیل لەبارەی پاپاکان و پیاوانی دیکەی کڵێساوە. بەڵام قەشە پیتەر لەو بڕوایەدا بوو کە نە جێگەو نە کات بۆ گەڕان بە دوای هەموو ئەو شتەو چاککردنەوەی هەڵەکان و دەرخستنی ڕاستی گونجاو نییە. ئەوەیشی بەلاوە ڕوون ئەبوو هەروەها تێشی نەدەگەیشت. بۆیە واباشترە ڕێ بە مرۆڤ بدرێت هەموو شتێك بڵێت. لەهەموو کات و سەردەمێکدا بە شێوەیەکی ئازادانە خەڵکی لێ نزیك بوونەتەوە، تەنانەت لێرە، خێرا پێوەندییان لەگەڵ دەبەست و بڕوایان پێدەکردو بە ئاسانی

ناخی دڵی خۆیان بۆ دەردەبڕی. بەلای ئەوەوەیش ئەم شتە شتێکی سروشتی و ئاسایی و بە ئاشکرا لێ دەگەیشت. بۆیە بەتەنگی ئەوەوە بوو بەردەوام گوێگرێکی باش بێت، هەروەها هەنووکەیش. بەڵام شتەکە لەگەڵ ئەم لاوەی خەڵکی شاری سمیرنا زۆر لەوە دوورتر ڕۆیشت و، ماوەیەکی دوورو درێژی خایاند. ماوەی چەندین سەعات خۆی ژ بیر دەکرد کاتێك لەمەڕ چارەنووسی جەم ـ سوڵتان دەدوا وەك بڵێیت سەبارەت بە بابەتێك بدوێت کە پێویستە زوو لە خودی ئەم ساتەدا شی بکرێتەوە، لەبەر ئەوەی سبەینێ درەنگ دەبێت. جار ناجاریش زمانی تورکی بەکار دەهێناو، جارێکی دیکە زمانی ئەسپانی، لە کاتی پەلەکردنیشدا لە یادی دەچووەوە ڕستەو گوتە فەرەنسی و ئەسپانییەکان وەرگێڕێت کە ئەزبەر دەیگوتنەوە.

قسەکردنەکەی بەیانیان زوو لە ژێر سێبەری سەیوانێکی گەرمدا دەستی پێدەکرد، کە تا دەهات سێبەرەکە کورتتر دەبووەوەو، لە شوێنی دیکەی ئەم لاو ئەو لای گۆڕەپانە نەفرەتییەکە درێژەیان پێدەداو، لە چنگی گەرمای هەتاوو شەڕو دەمەقاڵێ و یاری هێرش بەرانەو پڕ لە هەراو هوریای گیراوەکان هەڵدەهاتن.

قەشە پیتەر تێبینی ئەوەی کردبوو کە حاییم لەکاتی ئەو قسەکردنانەیدا خۆی دوورەپەرێز دەگرت و هەرگیز لێی نزیك نەدەبووەوە، لێی نزیك نەدەبووەوە تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە بەتەنیا تووشی دەبووە تووشیەوە. ئەگەر ڕووی دابایەو بە ڕێکەوت گیراوێك نزیك بووبایەتەوەو، هەوڵی دابایە گوێی لە چرپە چرپی لاوەکە ببوایە، ئەو کات جەمیل لەناکاو بێ دەنگ دەبوو وەك کەسێك بەدەم خەوەوە ڕێ بکات و لە ئاکامی بیر پەرتبوونی ترسناکەوە بەئاگە هاتبێتەوە، تەواو بێ دەنگ دەبوو، ڕادەوەستاو بە شێوەیەکی میکانیکی پچڕ پچڕو ناڕاشکاوانە دیگوت (بەڵێ، بەڵێ!)، پاشان خێراو بە ساردییەکەوە بە چەند وشەیەکی بێ واتا ماڵئاوایی لێدەکردو، دەڕۆیشت.

ڕۆژی دواتر دەردەکەوت و ڕوو گەشی و خۆشنوودییەکی ئەوتۆی تێکەڵ بە شوێنەواری نائاشکرای پەشیمانییەکی شەوانەی پێوە دیاربوو، لەگەڵ ئەو بڕیارەی دابووی، بێ دەنگ و کشابووەوە ناخی خۆی. بەبزەیەکی سووك کە هیچ شتێکی دەرنەدەبڕی و ئەوەندەی نەدەبرد نەدەما قسەکانی بەوشەی ئاسایی سەبارەت بە شتی

ناسایی ڕۆژانە دەست پێدەکرد. بەڵام هەر هەموو ئەوە کاتێکی کورتی دەخایاند. لەکاتی قسەکردندا بەشێوەیەکی هەست پێ نەکراو بارودۆخی دەروونی دەگۆڕا، بەشێوەیەکی هەست پێ نەکراو بەلای خودی خۆی و بەلای قەشە پیتەریشەوە. بۆ ئەوەی بزانێت چۆن، ئەیش لە کوێوە، ئە بۆچی، خۆی بە دەستی ئارەزووەکانیەوە دەداو، بە دەنگێکی هێورو چالاکانە بەسەرهات و چارەنووسی (جەم)ی بۆ قەشە پیتەر دەگێڕایەوە.

لە سێیەمین ڕۆژدا هەموو مێژوویەکی گێڕایەوە تا دەگاتە کۆتاییە ناهەنگ ئامێزو غەمگینەکەو، تا گۆڕە ڕووناك و بە شکۆکەی لە بۆرسە، کە دیوارە سپییەکانی بەجوانترین ئایەتی قورئان ڕازێنراوەتەوە کە بە سستمێکی دڵڕفێن بە شلەی پۆتاسیۆم لەسەر شێوەی گوڵ و کریستاڵی ڕیزکراو نووسراون. ئەو کات دەستی بە گێڕانەوەی هەڵوێستی جیاجیا بە وردەکارییەکانیانەوە کرد. چەندین هەڵویست بەدوای یەکدا دەهاتن وەك ملوانکەی ڕۆژگارە شادو غەمگینەکانی جەم، دیدارو ڕووبەڕووبوونەوەکان و، خۆشەویستی و ڕق و دۆستایەتییەکان و، هەوڵی هەڵاتنی لە دیلیەتی لای کریستیانەکان، هیواو ئاوات و نائومێدییەکانی، بیرکردنەوەی بە نیگەرانی دوورو درێژو خەونە لاوازەکانی لە ساتە کورتەکانی نووستندا، بەرسڤە پڕ لە شکۆو تاڵییەکانی بۆ کەسایەتییە ماقووڵەکانی فەرەنساو ئیتالیا، مۆنۆلۆگە توورەکانی لە کاتی تاك و تەنیایی و دیلیەتیدا، کە وا پێدەچوو بە دەنگێکی جوان ناگوترێن بەڵکو بە دەنگێکی دیکە دەگوترێن. بێ پێشەکی و بێ پێویستییەکی دیارو، بێ ئەوەی لە ڕووی کاتیشەوە بەدوای یەکدا هاتبن، لاوەکە بە دیمەنێك لە ناوەڕاستەوە یان لە کۆتایی ماوەی دیلیەتی جەم دەستی بە گێڕانەوەکەی دەکرد. بە دەنگێکی نزم قسەی دەکرد، چاوی لە خوارەوە بوو، بێ ئەوەی بایەخێکی زۆر بە هاوەڵەکەی بدات، گوێی لێیەتی، یان ئایە دەتوانێت گوێی لێ بگرێت؟

قەشە پیتەر تەواو لە یادی نەبوو لە ڕاستیدا کەی ئەو گێڕانەوە دەستی پێکرد کە نە یەك لە دوای یەکەو نەیش کۆتایی دیارە. یەکسەریش هەستی بە ـ ساتی دژوارو یەکلاکەر ـ نەکرد کە جەمیل بۆ یەکەم جار بە ڕوونی لە قسەی ڕاستەوخۆ سەبارەت بە چارەنووسی کەسانی دیکە چووە سەر قسەی ددان پێدانانی کەسایەتی خۆی و، وای لێهات بە شێوازی قسەکەری تاك قسە بکات.

(من ! ـ وشەیەکی گرانە، بەرانبەر بەو کەسانەی لەبەردەمیاندا دەگوترێت وەك بلێیت شوێنی چارەنووس و چەسپاومان دیاری دەکات، بە زۆری پێش یان پاش ئەوەی سەبارەت بە خودی خۆمان زانیمان، لە دەرەوەی ئارەزوو و لە سەرووی توانامانەوە. ئەو وشە سەیرەیە کە یەکەمین جار دەگوترێت تا هەتایە دەمانبەستێتەوە، بەو هەموو شتانەی بیرمان لێ کردوونەتەوە بەراوردمان دەکات و سەبارەت بەو شتانەی هەرگیز بیرمان لێ نەکردووەتەوە کە ئێمەی پێ بەراورد کراوە، وێڕای ئەوەی کە ئەو شتە هەر لە مێژە لە ئاخماندا ڕووی داوە).

قەشە پیتەر بە شێوەیەکی دووپات کراوەتر گوێی لە بەسەرهاتەکە دەگرت، بە خەم و خەفەتێکی ئەوتۆوە کە ناکرێت بشاررێتەوە. کاتێك ئێواران لە جەمیل دادەبڕاو بیری لەوو لە گێڕانەوەکەی دەکردەوە ـ شتێکی نەکەردەنی بوو بیر لەوە نەکاتەوە ـ سەرزەنشتی خۆی دەکرد لەبەر ئەوەی بە سووربوون و ڕاشکاوییەوە ڕاینەگرت تا پتر بەو ڕێگەیەدا نەڕوات کە بەرەو ئەو شتەی نابات کە باشە. چونکە نەیهەژاندو لە خەیاڵ پلاوەکانی قوتاری نەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا کاتێك ڕۆژی دواتر بەیەك دی دەگەیشتن و، کاتێك لاوەکە جڵەوی بۆ خەیاڵ پلاوە نەخۆشەکانی خۆی بەرەڵا دەکرد، دووبارە بە مووچڕکێکی سووك و سەرەخۆشییەکی قووڵ و پەشێوییەکی بەردەوام گوێی لێ دەگرت، ئایە قسەی پێ دەبڕێت و دەیهێنێتەوە دۆخی ئێستەی خۆی! کاتێك بڕیاردکەی خۆی بیردەکەوێتەوە کە شەوی ڕابوردوو بڕیاری لێ دابوو و لەو ساتەدا بە ئەرکی دەزانی و هەوڵی دەدا قسەکە بەرەو لای پرسێکی دیکە ببات یان تێبینییەکی ڕاگوزاری دەربڕی وەك بلێیت بە ڕێکەوت بێت تا جەمیل لە قسەکانی لەبارەی سوڵتان ـ جەم کە مردوود، دوور بخاتەوە، ئەوەی بە شێوەیەکی نا بەدڵ و بێ پێداگرتن دەکرد. هەستی بە بەزەییەکی قووڵ بەرانبەری دەکرد. تا ڕادەیەك وا هاتە پێش چاو کە توانای دەستپێشخەری و باش پێشوازی لێ کردنی ساکارانەی شادانە، کە بە هۆیەوە بەردەوام دەیتوانی هەموو شتێك بە هەر کەسێك بلێت، وەك بلێیت سڕ کرابێت یان بە کاریگەری قسەو دەمەتەقێی لاوان لەناو دەچێت. ئاکام شتەکە بەردەوام بە سستی قەشە پیتەر کۆتایی دەهات و، بەردەوام، بە بێ دەنگی گوێی لە چرپەی بە حەماسەتی لاوەکە دەگرت، بێ ئەوەی لەگەڵ ڕای ئەو بێت یان لە

لای خۆیەوە بەدەنگ بەرەنگاری بەرانبەر بنوێنێت. ئەوەی کە نەدەکراو، کە رووی نەدەداو، پێویستە روو بدات، لەوە بەهێزتر بوو کە دەکرا، روو بدات، کە دەبوو وەك تاکە راستییەك بە روونی روو بدات، جارێکی دیکە قەشە پیتەر دەگەڕایەوەو سەرزەنشتی خۆی دەکرد لەبەر ئەوەی ئەم جارەیش بەرانبەر بەو شەپۆلە شێتەی بەرەنگاری ناکرێت سستی نواند، لەبەر ئەوەیش کۆششێکی گەورەتری نەنواند لاوەکە بهێنێتەوە سەر رێگەی ئەقڵ. تا لەو ساتەدا هەستی بەوە کرد کە لەم شێتییەدا هاوبەشی هەڵەکەیە. بڕیاریشی دا سبەینێ لە یەکەمین ساتی گونجاودا ئەو شتە ئەنجام بدات کە ئەمڕۆ بەسەریدا تێپەڕی.

ئەم بارودۆخە پێنج تا شەش رۆژی خایاند. ئەوەبوو هەموو بەیانییەك لە هەمان ئەو کاتەدا وەك ئاهەنگێکی ورد دیاریکراو ئاخافتنەکە دەستی پێدەکردو، تا نزیکەی پێش خۆرئاوابوون بەردەوام دەبوو، دوو جار یان سێ جار پچڕانی تێدەکەوت. وا دەهاتە پێش چاو کە بەسەرهات و مەینەتی و کارە لەرادەبەدەرەکانی جەم ـ سوڵتان کۆتایی نەیەن. بەیانیانێك جەمیل دەرنەکەوت. بەدوایدا گەڕاو چاوەڕوانی کرد، بە نیگەرانییەوە بە هەموو شوێنێکی گۆڕەپانەکەدا پیاسەی کرد. ئەو رۆژە حاییم دوو جار لێی نزیك بووەوە، بەردەوام ئارەزووە ناسەقامگیرەکانی و، ئاخافتنی لەبارەی ئەو ستەمەی لە شاری سمیرنا هەیەو ئەو داوە هەمە جۆرانەی لێرە نراونەتەوەو، ئەو چاودێری و سیخوڕییەی لێرە لە گۆڕەپانە نەفرەتییەکە هەن پێشی کەوتبوون. قەشە پیتەریش واق وڕماوو بیر پەرت و بڵاو گوێی لێدەگرت و بیری لای جەمیل بوو کە دیار نەبوو.

خەیاڵی کرد کە بە تەواوەتی وەك دوێنێ دەیبینێت و گوێی لێ دەبێت، بەر لەوەی ماڵئاوایی لە یەکدی بکەن. زۆر خێرا قسەی دەکرد وەك بڵێیت شتێك دەخوێنێتەوە:

ـ جەم بە جل و بەرگێکی فەرمی جوانەوە، لەسەر پشتی کەشتییە راوەستاوەکەی ناو بەندەرەکە قیت راوەستابوو، چاودێری هێزە جۆراوجۆرەکانی پاپای دەکرد، کە بە جلە فەرمییەکانیانەوە ریزیان بەستبوو، لەگەڵ پیاوە بەرێزەکانی کڵێسەدا، بە روونی و چوست و چالاکان بیری لەو ساتانە دەکردەوە کە لە شوێنی نیشتەجێبوونی پێشوومان دوور دەکەوینەوەو هێشتە نەگەیشتووینەتە شوێنێکی دیکەی نیشتەجێ بوون. بە هێوری بیری

له بەدبەختی خۆی دەکردەوە، بە ڕوونی و ڕەقییەوە تەماشای کرد وەك پیاوێك بکرێت لە زاری بیانییانەوە گوێی لە بەختی شاراوەی نەبینراوی خۆی بێت.

ئەوەتە لە هەموو شوێنێك پێشوازی لێ دەکەن. ئەوانە پیاوانی بیانین لە دیوارێکی زیندوو دەچن دەورەی دیلیەتی ئەویان داوە. چی لەو پیاوانە چاوەڕوان بێت؟ سۆزو بەزەیی پێدا هاتنەوە؟ بەزەیی تەنیا شتێکی ئەوتۆیە ئەو پێویستی پێ نەبێت، کە بەدرێژایی ژیانی پێویستی پێ نەبووە. ئایە بەشداری ویژدانییە کە هەندێك جار کەسانێکی زۆر کەم و باش و بە گیان دەوڵەمەند بەرانبەر بە وی نواندوویانە؟ ئەو بەشداری کردنە کە بۆ ئەو تەنیا پێوانەکردنی مەودای بەدبەختی شەڕانی و سەرشۆڕی دەنواند کە بێ وێنەیە. سۆز قورس و سووکییە تەنانەت بۆ ئەو مردووانە ئەدی بەرانبەر بە زیندووانی بەتەندروست و ئاگەداری هەموو شت چۆن. چۆن دەتوانێت تەماشای ناو چاوی کەسانێکی بەویژدان بکات کە تەنیا یەك شتی تێدا بخوێنێتەوە کە ئەویش: بەزەییە؟.

بە ڕاستی ویستم هەموو ئەو شتانەی لەم جیهانەدا هەن بکەمە فاکتەرێك بەهۆیەوە ئەم جیهانە بکەمەوەو بە سەریدا سەربکەوم، کەچی هەنوکە جیهان ئێستە ئەو منی کردووەتە فاکتەری خۆی.

بەڵێ. کێ جەم جەمشیدە؟ بەندە؟! نا، وشەیەکی بچووکە. ئەو بەندەیەیە، ئەو بەندە گەوجەی بە زنجیر لە گۆڕەپانێکەوە بەرەو گۆڕەپانێکی دیکە ڕایدەکێشن، ئەوەی هێشتە ئومێدی ئەوەی هەیە ئاغا بەڕێزەکەی لێی ببوورێت، یان بارمتەکەی خۆی پێشکەش بکات، یان هەڵبێت. جەم نەیدەتوانی چاوەڕوانی لێبوردن بکات، نەیشی دەتوانی قبووڵی بکات ئەگەر ئەوەی بەرانبەریش ئەوەی بوێت پێشکەشی بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوانە سامانی تەواو لەم لایەن و ئەو لایەنەوە دەدەن بۆ ئەوەی بە دیل و بەندەو فاکتەر بمێنێتەوە، تا پارەنەدات و ڕزگار بێت (دایکی تەنیا کەس بوو، ئەو ئافرەتە پێداگرو، باش و، مرۆڤەی سەرووی هەمووان، بەو کۆششانەی نەیدەتوانی چ ئەنجام بدات تەنیا ئەوە نەبێت سەرشۆڕییەکەی قورستر دەکرد) ڕاکردن؟ دژوارە ئەو بەندەیەی ناوی خۆی لەدەست دابێت لە زنجیر هەڵێت، تەنانەت ئەگەر بتوانێت لە زنجیریش هەڵێت ئومێدی لا ئەوەندە نابێت شوێن

پێی خۆی لەو کەسانە بشارێتەوە کە دووی دەکەون، یان بگاتە ئەو شوێنەی وەك مرۆڤێکی سەربەست و ئازاد بێ ناو لە نێو کەسانی ئازادو بێ ناودا بژێت. جگە لەوە هیچ بارودۆخێکی گونجاوی نییە تا تێی قووچێنێت. ئەو هەموو جیهانەی دەیناسن و، نێوەی تێدا دەژین، لە ڕاستیدا بۆ دوو لایەن دابەش بووە: تورکی و کریستیان، لەناو هەردووکیشیاندا شوێنێکی هێور نییە، بۆیە ئەو لەوێ یان لێرە دەشێت هەر یەك بێت: سولتانێکی دۆڕاو یان سەرکەوتوو، مردوو یان زیندوو، بۆیە ئەو بەندەیەکە هیچ چارەیەکی نییە تەنانەت لە هزرو بیر یان خەوندا. جگە ئەوەی کە هەلاتن ڕێگەی کەسانێکی لەو نزمترو بەختدارترە، ئەوێك لەچارەی نووسراوە سولتانێکی بەردەوام بێت و، هیچ شتێکی دیکە نەبێت، تەنیا قوتاربوونی لەم ئاراستەوەیە. لە سولتان کەمتر بە یەك موویش نایەوێت چونکە ئەوە واتای ئەوە دەگەیەنێت بە یەك موویش گەورەتر نەبێت. تەنیا ئەمەو هیچ شتی دیکە نە. بەلام دیلیەتی و بەندایەتی کە ناتوانێت خۆی لە چنگیان قوتار و ئازاد بکات، تەنانەت پاش مردنیش.

پێشەوەی کەشتییەکە بە ئاستەم بەر تاوێرەکانی کەنارەکە کەوت. بێ دەنگی بە جۆرێك بالی بەسەر شوێنەکەدا کێشابوو تا ڕادەیەك ئەو بەرکەوتنەی بەرگوێ کەوت وەك بلێیت هەراو هوریایەکی بێ دەنگ بێت بە درێژایی ئەو کەنارەی هەر هەموویان لێی ڕاوەستاون، لە کاردینالەوە تا دەگاتە ئەسپەوانەکان، کە تەماشای ئەو پیاوە بالا بلندەیان دەکرد سەرپۆشی سپی لەسەر بوو بە دەزووی زێڕین ڕازێنرابووەوە، کە سێ هەنگاو لە پێشەوەی دەست و پێوەندەکەی چوون پەیکەر ڕاوەستابوو. هیچ پیاوێکیان تێدا نەبوو سولتانی نەبینیبێت یان لەوە دلنیا بێت کە ئەم بالا بلندە قیتە ناشێت هیچ شتێکی دیکە بێت تەنانەت ئەگەر لەو پێناوەشدا گیانی بەخشیبێت.

لەناکاو جەمیل ڕاوەستا کاتێك ئەوەی دەگێڕایەوە (تا ڕێ بە پاسەوانەکان نەدات وەك گیراوەکانی دیکە بەرەو ژوورەکەی قاوی بدەن. ڕاهاتبوو بەخۆی بچێتە ژوورەکەوە تەنانەت بە چەند سائێك پێش کاتی دیاریکراو). پاش سلاوێکی کورتی ئاسایی لە پێچێکی گۆڕەپانە نەفرەتییەکەدا لە چاو بزر بوو، کە هەندێك دەزووی تاریکی شەو بالی بەسەر گۆشە دوورەکانیدا کێشابوو.

# حەوتەمین پار

لاوەکە نە لە دووەمین ڕۆژو نە لە سێیەمین ڕۆژدا دەرنەکەوت. نزیکەی نیوەڕۆ حاییم هات و بەوڕی و بە تەنگەوەبوونەوە تەماشای هەموو شوێنێکی دەورو بەری دەکرد. گوتی ڕووداوی خراپ تووشی جەمیل بووە (ناکامی باشی لێ ناکەوێتەوە). نەیتوانی پتر لەوە بدرکێنێت.

دوای دوو ڕۆژ کە حاییم هێشتە نەیتوانیبوو هێور ببێتەوە، هات و بەسەرهاتێکی هەڵبەستراوی لە بارەی بزربوونی (جەمیل)ەوە پێبوو.

یەکەمین شت کەئەنجامی دا، کە ڕوو درژو سەری شۆڕ کردبووەوە، ئەوەبوو بە دەوری ئەو شوێنەدا سووڕایەوە ك ەقەشە پیتەری لێبوو، چەند بازنەیەکی ناسایی گەورەو هێلکەیی دروست کرد تا دەهات تەسکتر دەبوونەوە، لە کاتێکدا لە ژێرەوە نیگای بە هەموو شوێنێکی دەورو بەریدا پەرت دەکردەوەو، وەك بە ڕوونی پێدەچوو هەوڵی دەدا ئەو دیدارەی وەك دیدارێکی بە ڕێکەوت بێت لەکاتێکدا بەوێدا تێدەپەڕێت، نەیشیدەزانی کە ئەو خۆپارێزییەی چەند بێ سوودو ئاشکران. کاتێك گەیشتە تەنیشتی بە دەنگێکی کپ لێی پرسی:

ـ لێپرسینەەیان لەگەڵ کردن؟

ـ نا.

قەشە پیتەر بە دەنگێکی بیستراو وەڵامی دایەوە، لەکاتێکدا خۆپارێزییەکانی (حاییم)ی لا بوون بەشتگەلییێکی جێی بێزاری.

بەڵام ـ بە هێوای ئەوەی حاییم شتێکی لەبارەی جەمیلەوە لا بێت ـ بەدەنگێکی نزمتر گوتی:

ـ نەیانکرد. چی لەوێ هەیە؟

ئەو کات حاییم دەستی بە ئاخافتن کرد، لەسەر ئەوە سوور بوو لـە سـەرەتای دەست پێکردنیدا وەك ئەو پیاوە بێت بە ڕێکەوت بەوێدا تێپەڕیوەو ساتێك ڕاوەستابێت و درێـژە بە ڕۆیشتنەکەی خۆی بدات، لەو کاتەی بە نیگای سەرنجی ئـەم لاو ئـەو لای خـۆی دەدا. بەڵام وردە وردە دەسـتی پێکـردو لـەبیری چـووەوەو بـە شـێوەیەکی چوست و چـالاکانەتر دەپەیڤی بۆ ئەوەی دەنگی بەرز بکاتەوە.

لە ڕاستیدا ئەوانەی سەبارەت بەشوێن و ڕووداوەکان گێڕابوونیـەوە ئاشـکراو ڕوون نـەبوون و، نەدەشیا شی بکرێنەوە، بۆیە شوێنەکانی دیکـە کـە لـە ئاخافتنەکەیـدا نـاوی هێنـابوون وا هاتنە پێش چاو بـە شـێوەیەکی ورد گێڕابنیـەوە وەك بڵێیـت بەچـاوی خـۆی بینیـونی. حـاییم هەموو شتێکی دەزانی، بەڵکو ئەو شتانەیشی دەبینی کە ناشێت ببینرێن.

کاتێـك جـەمیل لەسـەرەتای تـاریکی نێـوارەدا بـەرەو ژوورەکـەی کـشایەوە کـە پاسەوانەکە لە دەرەوە کلیلی دا، ناو ژوورەکە هێشتە کەمێك ڕوون بوو. شیوەکەی لـەناو دوو دەفری بریقەداردا پێشتر دانرابوو تا سارد ببێتەوە، شیوێك بوو گێراوەکانی دیکە لەو جۆرە شیوەیان دەست نەدەکەوت. وەك هـەموو شـەوێك هـەموو شـتەکان ئاسـایی بـوون: پیاسەکردن لەم گۆشەوە بۆ ئەو گۆشەو، چاوەڕوان کردنی نوستن کە پێشتر دەیزانی خـەوی نایەت. ئەو دەنگانەی دوایی کە لە خوارەوەی گۆڕەپانەکەوە بەرگوێ دەکـەوتن لەسـەرخۆ کپتر دەبوون و، تاریکیش دیوارە سپی و شتەکانی دادەپۆشی، تا ڕادەیەك لە چوار دەوری پیاوە بەئاگەکە فشاری دەخستە سەر ژوورەکە. جیهـانێکی نـوێی شـەوانە پێـك دەهـات. چەند دەنگێکی نەرم بەرگوێ دەکـەوتن کـە ڕاسـت نـەبوون، لەگـەڵ چـەند تیـشکدانەوەو ڕووناکیدا، ئەویش لەئاکامی یاری بیستن و بیـنین لـە تـاریکی و نیگەرانیـدا. لـەم جـۆرە ساتەیشدا نەیزانی ئەو شتە چییە، گوێی لە کلیل بـوو بـە دوای کـونی قفڵـی دەرگەکـەدا دەگەڕا تا دۆزییەوەو چووە ناو کونەکەوە. فرت و فێڵی دەنگی بەدواوە نەبوو. بـە ڕاسـتی دەرگەکە کرایەوەو، لەو کاتەدا بۆ ئەوەی ورتـەیان لێـوە بێـت دوو کـەس هاتنـە ژوورەوە لاوێك لە پشتیانەوە بوو چرایەکی بەدەستەوە بوو یەکسەر لە لایەکـەوە ڕاوەسـتاو چـراکە بەرز کردەوەو بەو شێوەیە قیت ڕاوەستا بۆ ئەوەی بجوولێتەوە.

ڕووناکییەکە بەر هەموویان دەکەوت. یەکێك لەپیاوەکان قەڵەو بوو، هەموو شتێکی داهێزراوو تەرچك دەهاتنە پێش چاو: دیمەنی دەرەوەی، دەنگی، جم و جووڵەکانی. ئەوەی دووەم لاواز بوو تەنیا لە ئێسك و ماسوولکە پێکهاتبوو لە ژێر پێستێکی گەنم ڕەنگدا، هەردوو چاوی زەقی لەتاریکایی سێبەرەکەدا بزر بوویوون، هەردوو دەستە گەورەو ترسێنەرەکەی لەبەر ڕووناکییەکەدا دەبریسکانەوە. وا دەهاتنە پێش چاو کە دوو پیاوی نوێنەری دادوەری سوڵتانن کە دوو ڕووی هەیە. تەنیا یەکەمیان بە دەنگێکی قووڵ (قووڵییەکی ترسێنەر) قسەی کرد.

بەدەنگێکی نەرمی تێکەڵ بە مەترسی، یەکەمین ئەفسەر گوتی یەکەمین لێپرسینەوە شێوەیەکی ڕواڵەتی لە خۆگرتبوو، وەڵامەکانیش ڕواڵەتی بوون بۆیە نابێت لەسەر هەمان شێوە بمێنێتەوە.

ـ ئێوە جەمیل ئەفەندی ناچارن ئاکامی ئەو زانیارییانەتان لەسەر سوڵتان ـ جەم بۆ کێ کۆ دەکردەوە، بەباشی پلانێکی ئەوتۆتان بە وردەکارییەکانیەوە بە شێوازی شۆڕش دژ بە سوڵتانی شەرعی و خەلیفە داڕشتووە. چۆن فاکتەرو ڕێگە بەدەست دەهێنن بۆ ئەوەی بە یارمەتی دوژمنانی دەرەکی دەست بەسەر تەختی سوڵتاندا بگرن.

ـ بۆ کێ؟

لاوەکە ئەوەی بە دەنگێکی نزمی وەك ناڵەو ئازاری ژان گوت، لە بارودۆخێکدا بەرگری لە خۆی دەکرد.

ـ بەڵێ، بۆ کێ؟

ـ بۆ خۆم، بۆ هیچ کەسی دیکە نە. لەوە کۆڵیومەتەوە کە لە مێژووی خۆماندا زانراون، پێیاندا ڕۆچوومەتە خوارەوە. .

ـ ئەی چۆن؟ لە نێوان ئەو هەموو بابەتانەدا کە کتێبیان لەبارەوە دەنووسن و ئەو زانستانە هیچتان هەڵنەبژارد ئەمە نەبێت؟

بێ دەنگی.

(حاییم تەواو بەتەنگەوەبوونی خۆی ژ بیر کردبوو، بۆیە بەوپەڕی چوست و چالاکییەوە دەدوا، لەگەڵ جووڵەی دەربڕینی خێرای دەم و چاوو دەستی).

ـ گوێ بگرن ـ ئەفسەرە قەڵەوەکە بەدەنگێکی هێوری فەرمیانەی لووت بەرزانە درێژەی پـێ دا ـ ئێوە پیاوێکی تێگەیشتووی خوێندەواری سەر بە خێزانێکی دێرینن. وەك بە خۆتـان دەبیـنن کەوتوونەتە داوی کارێکەوە ئاکامی باشی لێ ناکەوێتەوە، یان یەکێك فریوی داون. ئێـوە دەزانـن کە ئەمڕۆ، وەك چوون دوێنێ، سوڵتان و خەلیفـە لەسـەر تـەخت دانیـشتووە(خـوا تەمـەنی درێـژ بکـات و سـەری بخـات!). ئـەوەی هەڵتانبـژاردووە تەنانـەت بـیر لێکردنەوەیـشی بابـەتێکی سەرکەوتووانە نەبوو، ئەدی چی لە بارەی لێکۆڵینەوەو لێوردبوونـەوەو لەسـەر نووسـینی دەڵێیـت و، تەنانەت قسە کردن لەبارەیەوە. ئێوە دەزانن وشە ئەگەر لە قووڵایی دارسـتانەکاندا گۆیکرێـت لە شوێنی خۆیدا نامێنێتەوە، بە تایبەتی کاتێـك دەنووسـرێت یـان تەنانـەت بـە کەسـانی دیکـە دەگوترێت، وەك ئێوە لـە شـاری سمیرنـا نووسـیوتانەو، ئاخـافتوون. بۆیـە ئـەم کارەمـان بـۆ شـی بکەنەوەو هەموو شتێك بڵێن ئەوەیش بۆ ئێمە ئاسانەو بۆ ئێوەیش باشترە.

ـ هەر هەموو ئەوەی تۆ لێوەی دەدوێیت پێوەندی بە منەوە نییە، تەنانـەت پێوەنـدی بە بیرکردنەوەیشم نییە.

دەنگی لاوەکە ڕاشکاوی و ڕاسـتگۆیی پێـوە دیـار بـوو، جـۆرە غـەمێکی قووڵیـشی تێکەڵ دەبوو. ئەو کات ئەفسـەرەکە وازی لە باری فـەرمی خـۆی هێنـاو دەنگـی مـۆرکی ڕاستەقینەی سروشتی خۆی وەرگرت بەلای خۆیەوە:

ـ کەمێك ڕاوەستن! ناکرێت پێوەندی بە ئێوە نەبێت. هەموو شتێك پێوەندییان بە هـەموو شتگەلێکەوە هەیە. ئێوە کابرایەکی خوێنـدەوارن، بـەڵام ئێمـەیش تـەواو نـەزان نـین. ناشـێت مرۆڤ بەرێکەوت یان بەبێ ئامانج خۆی لەقەرەی کارێکی بەو شێوەیە گەورەیە بدات.

بەردەوام ئەفسەرە قەڵەوەکە دەپەیڤی. جەمیل بـیری لـەو قـسانە دەکـردەوە کـە لـەم ئەفسـەرەوە دەیبیستن. بە شێوەیەکی ناڕوون وەلامی دەدایەوەو هاواری دەکرد:

ـ ئامانج! ئامانجی چی؟

ـ ئەمەیە دەمانەوێت بە تەواوەتی لە ئێوەی ببیستین.

لاوەکـە قـسەی نـەکرد. پیـاوە قەڵەوەکـە وای زانـی کـە توانیویـەتی بـڕوای بـەخۆی نەهێڵێت و سەر لێ شێواوی لە ناخیدا بـچێنێت، بـە بـڕوا بەخۆبوونـەوە درێـژەی پـێ داو پیتەکانی درێژ دەکردەوە:

ـ کەواتە تکاتان لێدەکەم!

ئەم دەربڕینە دوایی بە دەنگێکی ڕەقترو زبرتر گوت، بـە شـێوازێکی نـوێ و زارێکـی هەڕەشە کە بێ ئوقرەیی پێوە دیاربوو.

لاوەکە نیگای خستە سـەر گۆشـە تاریکـەکانی دەوروبـەری، وەك ئـەوەی بڵێیـت لـە دەرەوەی ئەم بازنە کاڵەدا بەدوای شایەتێکدا بگەڕێت. بیری کردەوە چۆن تـەنیا وشـەیەك یان تەنیا ڕستەیەك بڵێت بتوانێـت ئـەم تێنەگەیـشتنە گێلـە بـشارێتەوە، شـی بکاتـەوەو بسەلمێنێت کە هیچ مەبەستێکی لەو کارە نییە، پێویستیش ناکات ئـەوە شـی بکاتـەوەو بەرپرسیار بێت و، ناشتوانێت ئەو کارە بکات، بەلایەنی کەمەوە لەم ساتەو، لێـرەو بـەم شێوەیە. لەو بڕوایەدا بوو کە ئەو شتە دەڵێت بەڵام لـە ڕاسـتیدا بـێ دەنـگ بـوو، کەچـی هەردوو پیاوەکە قسەیان کرد (ئێستە لاواز دەستنیشان دەکرێت) خێراو بە سووربوونەوەو، یەك لە دوای یەکدی:

ـ قسە بکەن!

ـ دانی پێدا بنێن. ئەوەتان بۆ باشترو ئاسانترە.

ـ لە هەموو شتێکمان ئاگەدار بکەنەوە. کەی دەستتا پێکردووە؟

ـ بە تایبەتی بۆ چ ئامانج و، بۆ کێ؟

بە پرسیار سـەرقاڵیان دەکـرد. لاوەکـەیش لـە تـاوی ڕووناکیـدا چـاوی دەقووچـاندو، نیگای ترساوی بە گۆشەکاندا پەرت دەکردەوە. زۆری بە لاوە دژوار بوو کە خۆی ببینێـت سەرنەکەوتووە، یـان ناتوانێـت تێیـان بگەیـەنێت، یـان پرسـیارەکان لێـك جیـا بکاتـەوە. لەناکاو بینی پیاوە باریکەلەکە زۆرتر لێوەی نزیك بووەوەو دەنگی بەرزکردەوەو بە شێوەی تاك دەستی بە قسەکردن لەگەڵ کرد:

ـ دەی، دەی، قسە بکە!

لەو کاتەدا هـەموو ئاگـەیی ڕاوەسـتا، هەسـتی بـە سەرشـۆڕییەك کـرد داگیری دەکـات، هەستی بە دواکەوتوویی خۆی و بە لاوازی خۆی و، بـەڵکو هەسـتی بـە بـێ توانـایی بـەرگری لەخۆکردن کرد. لەوە گەیشت کە گوناه و بەدبەختییەکەی لە هـیچ شـتێکی (ئامانجـەکان)یـدا

نییە بەڵکو لەوەدایە کە دەتوانن مرۆڤ بەرەو بارودۆخێك ڕاکێشن (یان ناچاری بکەن بەپێی خۆی بێت) کەسانێکی لەو جۆرە بتوانن لەبارەی ئەوەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکەن. دەیویست ئەوە بڵێت، بڕوای وابوو کە ئەوەی گوت، بەڵام بێ دەنگ بوو.

بارودۆخەکە بەو شێوەیە بەڕێوە چوو، ماوەیەکی درێژیش بەردەوام بوو. لە ساتێکی ئەو شەوەدا، لەدەرەوەی ئەو کاتەیە کە هەتاو کاتی شەوو ڕۆژ بە خۆر هەڵاتن و خۆر ئاوابوون دەپێوێت، لە ساتێکی دەرەوەی هەموو پێوەندییە مرۆییەکان، جەمیل بە هەموو ڕاشکاوی شکۆوە ددانی بەوەدا نا کە لە ویژدانەوە بەشداری لەگەڵ جەم ـ سوڵتاندا دەکات، ئەو پیاوە بەدبەختەی، کە بە بەدبەختییەکەی لە هیچ کەسێکی دیکە ناکات، هاوچەشنەکەی کە خۆی تووشی تەنگانەیەك کردووە لێ قوتاربوونی دژوارەو، نەیویست و نەیتوانی نکۆڵی لەوە بکات کە ئەو شتە ڕاست نییە.

ـ من ئەمەم! ـ جارێکی دیکە بە دەنگێکی نزم، بەڵام توند گوتی، وەك جۆرە ددان پێدانانێکی کۆتایی و سەرەکی بوو، خۆی بەسەر کورسییەکەدا دا.

ئەفسەرە قەڵەوەکە بە جووڵەیەکی خێراو ئاسایی جڵەوی خۆی لەدەست داو بێ دەنگ بوو. بەڵام ئەفسەرە باریکەلەکە، وەك بڵێیت هەستی بەو شتە تۆقێنەرە بەرانبەر بە پیاوێك نەکردبێت وا پێدەچوو تێکچووبێت و هاوسەنگی خۆی بەدەستەوە دابێت و، بەم جۆرە تا هەتایە لە دەرەوەی جیهان و یاساکانی دانراو، بە گێل و گەوجی و بەرچاو تەسکی و هەڵچوونی کارەکەی وا بە ئاسانی زانی بۆ ئەوەی سوود لە شوێنە چۆڵەکە ببینێت کە هاوەڵە زیرەکەکەی بۆی ڕەخساند، بۆیە پرسیاری نوێی ئاراستەکرد ئەویش بە مەبەستی وەدەستهێنانی ددان پێدانانێك لەلایەن لاودکەوە سەبارەت بە پیلانێك هەرچۆنێك بووبێت لەشاری سمیرنا دارێژرابێت.

جەمیل لەسەر کورسییەکی نزمی بێ دەستك دانیشتبوو، ماندوو دیار بوو بەتەواوەتی نغرۆی ناخەودی خۆی بووبوو. ئەفسەرە باریکەلەکە پیاسەی دەکردو لەدەوری گاڵتەی دەنواند، خێسەی لێ دەکرد، [illegible] تە خە[illegible]اڵی ئەوەی ددکرد ئەوەی لە بەردەمیدا دەیبینێت لاشەیەکی بێ خواست و بێ هۆشە. دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی

هەڵیسوورێنێت. ئەمەیش پتر درووژاندی و پتر پاڵی پێوە نا کەمتر بیّ ئوقرەو ڕەچاوکارو لێگەیشتوو بێتە پێش چاو. لە ساتێکدا وا هاتە پێش چاو کە یەکێك لە لەپە ناشیرینەکانی درێژ کردەوە تا لەسەر شانی (جەمیل)ی دانێت. بەڵام لاوەکە کە نغرۆی نائومێدی بووبوو، بەرانبەر بەم لێك نزیکبوونەوە بێزراوە هەستی بە ڕشانەوەو بێز لێهاتنەوە دەکرد، توند پاڵی پێوە نا. ئەو کات، لەچاو تروکانێکدا، شەڕێکی ڕاستەقینە دەستی پێکرد ئەفسەرەکەی دیکەیش بەشداری تێدا کرد. جەمیل بەرگری لە خۆی دەکردو بەوپەڕی هێزو تواناوە هێرشی دەبرد کە کەس پێشبینی نەکردبێت. لەو کاتەدا لاوەکە بە خۆی و چراکەی دەستییەوە کەوت، کاتێك، لە گەرمەی دەست وەشاندن و پێ لەقەو لێدان توانی لەم داوە شێتە بکشێتەوە، ڕای کردە دەرەوە. لەکاتێکدا شەڕ لەناو ژوورە تاریکەکەدا بەردەوام بوو، هەموو نهۆمەکە درووژا (لە لاوە ڕاکردووەکەو لەو گیراوانەی بە ئاگە هاتبوونەوە). هەموو گۆڕەپانەکە بەم ڕووداوە شەوانەیان زانی کە لەگەڵ لاوەکەی شاری سمیرنادا ڕووی دا، حاییم یەکسەر ئاگەی لە هەموو شتێکە لە گۆڕەپانەکەدا بەگوێی یەکدییەوە بچپێنرێت.

ئەو شەوە (جەمیل)یان بەچوار پەل هەڵگرت و لە دەروازەیەکی سەرەکی گۆڕەپانە نەفرەتییەکە بردیانە دەرەوە.

ـ زیندووە یان مردووە!؟ بۆ کوێیان برد.

قەشە پیتەر بە هەڵچوون و دانەساکانێکەوە بیری کردەوە. هەرچی (حاییم) بوو وەڵامی ئەم پرسیارەیشی دابووەوە:

ـ ئەگەر زیندوو بێت ئەوە پێدەچێت بۆ تیمارخانەیان برد، قاوشی سلێمانی کە نەخۆشانی دەروونی لیّ بەند دەکرێت. لەویّ لەناو ئەو شێتانەدا سەربوردەکانی لەبارەی جێگرەوەی تەختی سوڵتان وەك هەموو ئەو وشەو ناخافتنانەی لیّ دێت کەشێتەکان لەنێوان خۆیاندا دەیانکەن، خەونی نەخۆش کە هیچ کەسێك ئاوڕی لیّ ناداتەوە. هەرچۆنێك بووە ئەوە پیاوێکی شێت و نەخۆش زۆر ناژیت، بەڵکو بە ئاسانی و بەخۆی و

بەخەونەکانی لەم جیهانەدا بزر دەبێت، بۆ ئەوەی کەس ناچار ببێت بەرانبەر بە هەر کەسێکی دیکە بەرپرسیار بێت.

هەرچۆنێك بێت، ئەگەرچی شەڕەکە بە هەموو دڕندایەتی خۆی دەستی پێ کردبێت و، ئەگەر لاوەکە لەکاتی بەرەنگاربوونەوەدا لەو تێکهەڵچوونەی لەگەڵ هەردوو پیاوەکەدا یەکێکی بریندار کردبێت (وەك پێدەچێت شتەکە وابوو، دواتر ناچار بوون شوێنەواری خوێن لەناو ژوورەکە بسڕنەوە) ئەو کات مەزەندەی ئەوە دەکرێت کە پیاوانی سوڵتان هەموو داخی خۆیانیان پێدا ڕشتبێت، چونکە لێرەدا ناشێت مستەکۆڵەکان هاوسەنگ بن بەڵکو بەئاسانی پتر لەوەی پێویستە سەردەکەن. لەو حاڵەتەشدا ڕەنگە کوڕەکەی تاهیر پاشا ئێستە لەناو گۆڕدا نێژرابێت. ئەم جۆرە گۆڕەیش بەردێکی سپی هەیەو هیچ لەسەر کێلەکەی نەنووسراوە، سەبارەت بە هیچ نادوێت، بەتایبەتی سەبارەت بە سوڵتان یان جێگرەوەکانیان و شەڕەکانیان لەگەڵ کێبەرکێکارەکانیاندا.

پاش ئەوەی حاییم سەربوردەکەی تەواو کرد ئەم بەسەرهاتەی تا کۆتایی گێڕایەوەو جارێکی دیکە (مەترسییەکان)ی دەورو بەری بیر کەوتەوەو بۆ ماڵئاوایی کردن دوور کەوتەوەو، ورد ورد تەماشای دەورو بەری خۆی دەکرد، دەکۆشا خۆی چوون کابرایەك پیشان بدات بە گۆڕەپانە فرەوانەکەدا بۆ ئامانج دەسووڕێتەوە.

قەشە پیتەر لە ڕقاندا ددانەکانی بۆ ئەم چارەنووسەی جیڕ کردەوە، بەڵکو بۆ هەموو ئەوەی لە دەوروبەریەتی، تەنانەت بۆ ئەم (حاییم)ە بۆ تاوانەیش و، پێویستی بەردەوامی بۆ زانینی هەموو شتێك و گواستنەوەو بڵاوکردنەوەی بە وردو درشتەوە. لەشوێنی خۆیدا بێ جووڵە ڕاوەستاو، ئارەقەی ساردی تەوێڵی سڕی، بێ ئەوەی تێ بگات و بزانێت تەماشای زەوییە زیوین و دیوارە سپییەکانی بەردەمی دەکرد، وەك بڵێیت یەکەمین جارە دەیبینێت، هەستی دەکرد چۆن شەپۆلێکی نەرمە ترس لەشی دەتەنییەوە، لەبەر ئەوەی سەبارەت بە ناخافتنەکانی لەگەڵ جەمیلدا پرسیاری لێ ناکەن یان لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکەن، جارێکی دیکەیش ناچاری لێپرسینەوەیەکی ناکەن کە هێوای بەدواوە نەبێت

لەکاتێکدا بێ تاوانە. ئەگەرچی حایم پیاوێکی سەرشێت بوو و هەستی بە مەترسی دەکرد لەو شوێنانەی کە لێی نین، بەڵام ئەگەری هەموو شتێك لەئارادایە.

پاشان ئەو هزرانە خێرا پاڵەپەستۆیان خستە سەر هزری دیکە: جەمیل چی بەسەر هاتووە؟ پاشان گەرمایەکی ناخۆش بەرز دەبێتەوەو ئێستە هەموو شتێك دادەپۆشێت، لەگەڵ ئەفسووسێکی قورس، کە ناکرێت بەم شێوەیە بەرگەی بگیرێت لە کاتێکدا مرۆڤ لە دۆخی مت بوون و پەشێوی تەواودا بێت. هەستی کرد پێویستی بە گۆڕینی شوێنەکەی هەیە، بۆ ئەوەی کەسانی دیکە ببینێت و گوێی لێیان بێت، کەسانێکی دیکەی دوور لەم یەسەرهاتە ڕەشە نەزۆکەکانی شارۆچکەی سمیرنا، بۆ ئەوەی کەسانێکی دیکە ببینێت گرنگ نییە چ بن، گرنگ ئەوەیە لە دەرەوەی ئەم تۆڕە شێتە بن کە چەند نەخۆشێك لە نێوان خۆیاندا دەیچنن و توند دەیبەستن و ڕایدەکێشن و پاڵەپەستۆی دەخەنە سەر، نەخۆشانێك ڕێگەی ئەقڵیان بزرکردووەو، پۆلیسی سوڵتان ئەوانەی گیان و ئەقڵیان لەدەست داوە، لەدەرەوەی ئەم تۆڕە کە ئەوەتە خۆیشی گرتووەو لە قاچی ئاڵاوە بێ ئەوەی هیچ تاوان و گوناهێکی کردبێت.

بە گۆڕەپانەکەدا بەرەو سیبەری گۆشە شاراوەکان ڕۆیشت، کە چەند کۆمەڵە گیراو هەبوون تێك دەگیران و یاری و گاڵتەیان دەکردو هەراو هوریایان بوو.

# هەشتەمین پار

دوای دوو ـ سێ ڕۆژ، دەرکەوت کە لە سەر ئاخافتنە دوورو درێژەکانی لەگەڵ (جەمیل)دا لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکەن. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو شتێك کۆتایی هاتووە ـ نێژراویشە. ترس و چاوەڕوانی و نیگەرانی ڕەوینەوە، بەڵام یارودۆخەکە باشتر و ئاسانتر نەبون. بە پێچەوانەوە. کاتی بەبێ جەمیل بەسەر دەبرد، ناتوانێت لەبیری بکات، وێڕای ئەوهەستەی لە ناخیدا بوو کە ناتوانێت هیوای ئەوەی هەبێت جارێکی دیکە جەمیل ببینێتەوە.

کات هێشتە هاوێنێکی گەرمی ڕاستەقینە بوو. هەموو شتێکی ناو گۆڕەپانەکە هەر وەك چۆن بوون وابوون. هەندێکیان ئازاد دەکران، کەسانی دیکە دەهاتنە شوێنیان، ئەوەیش بە وردی تێبینی نەدەکرا. هەموویان پلە دوون و گرنگ نین، چونکە گۆڕەپانەکە لە پێناوی خۆیدا دەژیت، بە هەزار هەزار گۆڕانیشەوە، کەچی بەردەوام هەر وەك خۆیەتی. هەموو بەیانیانێك لە سێبەردا گرووپی هەمان زیندانیان یان گرووپی دیکە گرد دەبنەوە. قەشە پیتەر لای بازنەی یەکەم (بازنەی دراوسێیان) ڕادەوەستێت. لێرە هەر هەمووی وەك هەندێکی وایە. هەر هەمان سەرکردەیە ژن دەهێنێت و بە هەمان شێوەیەیش تەڵاقی دەدات، بەردەوام لەگەڵ ئافرەتی نوێدایە، بەردەوم هەندێکیان بە درۆی شاخدار تاوانباری دەکەن، کەچی ئەوانی دیکە گوێی لێدەگرن. ڕەنگی پەڕیوە، بەو دەم و چاوە سەوزە ڕەش داگەڕاوەیەوە وەك بڵێیت نەخۆش زەردکی گرتووە، چونکە بەردەوام ڕوانینی پێوەندی بەوەوە نییە کە دەیڵێت، پیاسە دەکات، بەستەزمان و شێت بووە لە دەستی ترس و بیرو هزری شاراوەی لەمەڕ ئەو سزایەی چاوەڕوانی دەکات، ئەگەر بێت و ئەوەی بەسەردا بسەلمێنرێت کە پێی تۆمەتبار کراوە.

ئەوانی دیکەیش سەبارەت بە ئافرەتان دەپەیڤین، بەڵام بە شێوازێکی دیکە. چونکە دەنگی پیاوێکی وەرزشوانی فیلەتەن، کە گڕو ناقۆڵا بوو وەك ئامێری کۆنتەرباس بەسەر هەموو دەنگەکاندا زاڵ بوو، بەڵام کەمێك دەمکوتیان دەکرد تا لەگەڵ ئەوانی دیکەدا گوێ لە کەشتییەوانە پیرەمێردەکە بگرێت سەبارەت بەو کیژە یۆنانییە دەدوا لە مەیخانەکەیاندا کاری دەکرد.

ـ تەنی لەو زلترو دژوار ترم لە ژیاندا نەبینیوە، کەشتییەك بوو دەڕۆیشت، هەردوو مەمکی وەك سەرین لە پێشی خۆی دابوو، لە پشتەوەیش دوو سمت دەجووڵانەوە، هەر یەکەو دەستی بۆ دەبردو لەو شوێنەی دەگرت کە دەیتوانی بیگرێت. ئەویش بەرگری لە خۆی دەکرد، خاوەن مەیخانەیەکەیش بەرگری لێ دەکرد، ئەو یۆنانییەی کە هەندێك لە ددانەکانی هەڵکێشابوو، هەندێکی دیکەیشی مابوون. بەڵام کێ دەتوانێت دەستی کەشتییەوانەکان بگرێت کە پاش کەمێکی دیکە دەست بە نقورچك لێگرتنی دەکەنەوە؟ لە ئاکامدا ناچار بوو واز لەکار کردن بهێنێت. بە لایەنی کەمەوە خاوەن مەیخانەکە وا دەڵێت، بەڵام نا، هەر ئەو بە خۆی لە ماڵەکەی خۆی داڵدەی داوە، ئەو گورگە بۆ خۆی لەماڵەوە داڵدەی داوە. دەریاوانەکان سەرزەنشتی دەکەن و ئاخ هەڵدەکێشن:

ـ ئاخ، چ زیانێکە، ئافرەتی لەم جۆرە، وەك چەپکە گەنم وایە، وەك چەپکە گەنم وایە! یۆنانی ئەمە بە خۆی دەڵێت پتر لەوەی بە کەسانی دیکەی بڵێت: (ئەگەر کار وا بڕوایەت، هەرکەسەو پێی گەیشتباو نقورچکی لێ گرتبایە، چی ڕووی دەدا؟ ئەو کات دەیانپچڕاندو گوڵە گەنم دوای گوڵە گەنم هەڵیان دەگرت تا چەپکەکەیان تەواو دەکرد. ئەوانە نەفرەتین!).

ـ ئاخ ! دەنگە گڕەکەی لە ئامێری کۆنترباس دەچێت ناڕەزایی دەردەبڕێت ـ ئاخ، ئاخ، چەند گێل و گەوجن نازانن بدوێن تەنیا باسی سۆزانی مەیخانەکان نەبێت وەك ئەو سۆزانییە! سەبارەت بە هەموو شتێکی بێزراو، ئاخ!.

ئیدی شیکردنەوە دەست پێدەکات، کە (کۆنترباس)ی تێدا سەرکەوتوو نابێت، چونکە هەموویان بەشداری لە کپ کردنی دەریاوانەکە دەکەن و داوا دەکەن کۆنتەرباس درێژە بە گێڕانەوەکە بدات کە پێشتر دەستی پێکردبوو. ئەویش درێژە بە گێڕانەوە

سەیرەکەی خۆی دەدات، کە تەواو ڕوون نییە، سەبارەت بە ئافرەتێکی زۆر جوانە، بە نژاد خەڵکی (کرۆزیا)یە. ئافرەتێك بوو لێرە لە ئەستەنبوڵ شتی سەیرو سەمەرەی لە دەست ڕووی داو، کە مرد هێشتە لە هەرەتی لاویدا بوو.

ـ جۆرێکە لەو مرۆڤانە: داپیرەی شاژنی جوانی بوو. هەموو خەڵکی تەفلیس بۆی شێت بوون. بەڵێ. لە یەکێك لە گوندەکان لای خزمەکانیان شاردیانەوە بۆ ئەوەی لە (تفلیس)ی دوور بخەنەوە. ئەو گوندەیش تا هەنووکە بە ناوی ئەوەوە ماوەتەوە. بەر لەوەیش ناوێکی دیکەی هەبوو نایزانم. لە پێناوی ئەوو لە پێناوی جوانی ئەودا لە ماوەی نیو سەعاتدا لە دەوری ماڵەکەی سەری حەوت کوژراو خەڵتانی خوێن بوون. داخوازیکارو ڕفێنەران لە نێوان خۆیاندا تێك گیران. سێ خێزان ڕەشیان پۆشی و، ئەویش لە خەفەتاندا مرد. تەنانەت کە مرد نەیویست ناوی ئەو پیاوە بدرکێنێت کە خۆشی ویستبوو، ئەیش وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە ئایە ئەو پیاوە یەکێکە لەو کوژراوانە یان هێشتە زیندووە. بەم شێوەیە ئەو ئافرەتە ئەو جوانی و ئەو باڵاو ئەو چاوانەی لە داپیرەیەوە بۆ مابووەوە...

ـ بەڵێ ـ یەکێك لە پیاوانی بازنەکە ئەوەی گوت ـ ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە کیژانی کرۆزیا چاویان زۆر جوانە.

ـ زانراو چییە؟ لەکوێوە زانراوە؟ کوێر تۆ چی سەبارەت ئەم شت و کارانە دەزنیت؟

ـ چۆن نازانم؟ وەك بڵێیت تەنیا تۆ لەم جیهانەدا شت دەزانیت!

هەندێك دەنگ ناڕەزاییان دەربڕی.

ئەوانی دیکە گوتیان:

ـ قسەی پیاوەکە مەبڕن، ڕێی بدەن با بئاخڤێت.

ـ تۆ بئاخڤێ (سومەیە) و ئاوڕ لە هیچ کەسێك مەدەوە، هەر کێیەك بێت.

ـ براله توانای قسەکردنم نەماوە. ئاخافتن چ سوودێکی لەگەڵ ئەم سەکێکی کوێری وەك ئەمدا هەیە؟

هەموویان سوورن لەسەر ئەوەی قسە بکات. ئاکام، وەك چۆن بەردەوام ڕاهاتووە، دەیبینیت بە شێوەیەك هێور دەبێتەوە تا لەسەر گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکەی لەبارەی

ئافرەتە کرۆزییەکەو چاوەکانی درێژە پێ بدات، لەکاتێکدا هێشتە هەر بە گلەو گازەندەو تووڕەیە.

ـ کاتێك یەکێکیان پێم دەڵێن (فلانـە ئافرەت دوو چاوەی جوانی هەیە) گەردوونم لەبەرچاو تاریك دادێت. چ جۆرە چاوێك! داوا لەیەزدان دەکەم لەسەر ئەو کوێرییەوە کوێرتر بێت! کاتێك تەماشای ئەو دو چاوە دەکەیت، ئەوە ناشێت بەو دوو دووربینە بیر بکەیتەوە کە هەر یەکەمان لەناو سەرماندا هەڵمانگرتوون، بەڵکو بیر لە دوو کێڵکەی ئاسمانی لە هەتاوو مانگی خەواڵوو دەکەیت. چ ئەستێرەو چ هەورێکەو چ سەیرو سومەرەیەك لەو دوو کێڵگەدا چێنراون! (سومەیە)ی بەستەزمان! دەیانبینێت یەکراست دەبێتە بەردو، دواتر دەتوێتەوە. بە ئاسانی ئیدی نامێنێت! ئایە هەموو ئەمە (تەنیا دوو چاون)؟! ڕاستە وەك شتەکانی دیکە بۆ بینین بەکاردێن، بەڵام ئەمە بایەخی کەمترە، بۆ ئەوان ئەمە دوایەمین شتە. دەڵێیت دوو چاو؟! پێم بڵێ چییەو سوودی چاوە بچووکەکانمان چییە کە بەسەرمانەوەن؟ بۆ ئەوە دروست کراون تا بە هۆیانەوە بزانین دەرگە لە کوێیەو کەوچك بۆ دەرەوەی دەممان نەبەین؟! ئەی چاوەکانی ئەو چین؟ دوو پەرجووی یەزدانین! لێرەدا ناتوانرێت بەراوردکاری بکرێت. جارێکیان ئەوە لەسەر ڕووی ئەم گەردوونە ڕووی دا. یەك جار کە دووبارە نابێتەوە. ئەمەیش چاکەیە. بۆ ئەوەی ئازارو ئەشکەنجەو ئاخ هەڵکێشان کەمتر ببێتەوە. دوو چاوی لەو جۆرە چاوە نابێت وەك ئەوانی دیکە بمرن، یان تەنانەت لەم جیهاندا هەر لە سەرەتاوە لەدایك بن.

پیاوەکە لەناکاودا بێ دەنگ دەبێت. دەنگی فریای ناکەوێت. بازنەکەیش هیچ ورتەیەکیان لێوە نەهات یان پلارێکیان نەهاویشت. ئەمە ساتێك بەردەوام بوو، پاشان سەرلەنوێ ئاکۆکی و پێکەنین و هەراو هوریای دەنگی گڕی تێکەڵاو لەگەڵ جنێوی ناشیریندا دەستی پێکرد.

قەشە پیتەر لەدووردوە ئاگەی لەو ئاخافتنەی ئەو بازنەیە بوو کاتێك هەستی کرد یەکێك لە پشتیەوە ڕاوەستاوە، کاتێك ویستی وەرچەرخێتەوە (حاییم)ی بینی لە تەنیشتیەوە ڕاوەستابوو.

قەشە پیتەر هەرکە بە گۆڕەپانەکەدا پیاسەی بکردایە بەردەوام بەم جۆرە تووشی بەتووشی (حاییم)ەوە دەبوو، حاییم کە بەردەوام نیگەران و پەشێو لەرزۆك بوو، بەردەوام شوێنەکەی خۆی دەگۆڕی. هەر کاتێکیش هاتبایە شتە سەیرو سەمەرەکانی لەگەڵ خۆی دێناو، سکاڵای لە دەستی هەموو شتێك دەکردو هەموو مرۆڤێك لێرە چاوەڕێی دەکرد، دەست بەجێش هەموو کارەکانی خۆی قایم دەکرد. دوای ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ئەو شوێنەی بەجێ دەهێشت و بە دوای مەکۆیەکی هێورتردا دەگەڕا. هەندێك جار لەکاتێکدا بە قەشە پیتەر دەگەیشت بەلایدا تێدەپەڕی وەك بڵێیت نایناسێت، هەندێك جاریش بەسەر جوولانەوەیەك سڵاوی ئاراستە دەکردو، چاوی دەترووکاند تروکاندنێکی بێ واتا. هەندێك جاری دیکە لێی نزیك دەبووەوەو ڕادەوەستا تا ئازادانە لەگەڵی بدوێت، تا شتێکی بیر دەکەوتەوە، ئەو کات تێی دەتەقاندو دوور دەکەوتەوە. ئێستەیش هەر وای کرد، لەبەردەم قەشە پیتەردا ڕاوەستاو لەبارەی پیاوە دەنگ گڕە کۆنتەرباسەکەوە ئاخڤی. لێرەیش هەموو شتێکی دەزانی.

کابرایەکی ناڕەسەنە. بەهۆی هێزو تواناو خۆگەیاندنە چینی ئاغاکانەوە سەرکەوت. لەماوەی چەند ساڵی ڕابوردوودا پاڵەوانێکی ناسراوی زۆرانبازی بوو لە تورکیا. لەسوپایش بەڵێندەر بوو، خاوەند قاوەخانەیش بوو، قۆنتەراتچی هەموو جۆرەکارێکیش بوو. پارەیەکی زۆر بە ناو دەست و لەپی ئەم پیاوەدا دەهات و دەچوو. پیاوێکی قومارچی و سەرخۆش و، بە تایبەتی دۆن جوانی ئافرەتان بوو، تەنانەت تووشی نەخۆشییەکی خراپ هات. لە ژیانی خۆیدا هیچ کات پاك نەبووە، هیچ جیاوازییەکی لەنێوان ئەوەی خۆی هەیەتی و ئەوەی خەڵك هەیانە نەدەکرد. ژیان و گوزەرانی وەك چۆن ویستوویەتی بەو شێوەیە بە ئاسانی بەڕێوەچووە کاتێك بەتواناو بە ئەقڵ بوو. بەڵام ماوەی دوو ساڵ سێ ساڵە، تا دەهات بەرەو خوارترو خوارتر دەچوو. هەموو نەژماردەکانی خۆی لەدەست دەدا. ئافرەتان مێشکی دەخوارد، هێزی پەرت بووەوە. ئاکام برادەرە کۆنەکانی بەجێیان هێشت و وازیان لێهێنا نغرۆ ببێت. تێکەڵاوی سووکترین و بێ قیمەتترین تاوانباران بوو. کە گەیشتە ئێرە ئیفلاس بوونی خۆی ڕاگەیاندو، چەندین جار دەستی خەڵکی بڕی. ئەوەتە لێرە پێی ناوەتە ناو دوو مانگەوە کەچی هەر لە قۆناغی لێکۆڵینەوەدایە. زۆر ئاشکرایە کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەرەس دەهێنێت و، هۆشمەندی

نامێنێت کە بەخۆی کەمە، تەنانەت وای لێهاتووە جیاوازی لە نێوان ئەو شتانەدا ناکات کە بە ڕاستی هەن و ئەو شتانەی دەبێت بکرێن لەوەی ناکرێن و دەشێت ڕووبدەن، سەر زمان و بن زمانی باسی ئافرەتە.

ئەم نەخۆشییە تووش بووە، ناتوانێت بڕوا بەوە بهێنێت و دڵنیا بێت کە خۆشەویستی لای ئافرەت، ئارەزوو لای ئافرەت هەیە، یان تەنانەت هزرێك، بێ ئەوەی خۆی بەشداری تێدا بکات. وەك کولّوە قەندێك لەناو ئاودا دەتوێتەوە، تەنانەت ئەو زەوتکەرە بەهێزو وێرانکەرە هیچ شتێکە نەماوەتەوە تەنیا ئەو ئاکۆکییە بێ سەرو بەرانە نەبێت لەگەڵ بێکارەکاندا، لەگەڵ پێویستی بەردەوامی بە ئاخافتن و فرەوێژی. تەنانەت لە ڕۆژانی دواییدا پتر هەستوەر بووە، لاوازو باریك بووەتەوەو پتر هۆگر بووەو، قسەکانی پتر دەوڵەمەندو بەگوڕتر بوونەو هاوارێکی پێشووی کە ناوبانگی پێ دەرکردبوو بووبووە دەنگێکی گڕی هەڵچووی نەشاز لە هەندێك شوێن بڕگەی پچڕ پچڕی فرمێسکاوی و گریاناوی گرژی تێدەکەوت، کە خۆی دەیویست بە هەڵشاخان بەوانەی دوورو بەریدا بیانشارێتەوە.

ـ وای لێهاتووە ناتوانێت بێ دەنگ بێت. ئەڵقەکانی سست و گرژ بوونەتەوە، وەك دەبینن لە هەموو لایەکەوە خاڵ دادەنێت. کۆتایی هاتووە.

حاییم بە دەنگێکی بڕوا بەخۆبوون و بەرزو پڕ شادییەوە دەپەیڤی و بەردەوام هەموو شت و هەموو ڕووداوێکی دەخستە ڕوو، تا لەناکاو ڕادەپەڕی و، تەماشای ئەم لاو ئەو لای خۆی دەکرد وەك مرۆڤێك لەناکاو لە خەو هەستابێت، هەردوو چاوی هەڵدەتەکاند، ئاماژەیەکی نهێنی نەزانراوی بە برادەرەکەی دەدا، پاشان بە بێ سەڵاو، بە هەنگاوی کورت و لەسەرخۆو سەری دانوشتاو دوور دەکەوتەوە، وەك پیاوێك بەدوای شتێکدا بگەڕێت بزری نەکردبێت.

قەشە پیتەر درێژە بە پیاسەکردن بە گۆڕەپانەکەدا دەدات تا دەگاتە بازنەیەکی دیکەو دەپرسێت: ئایە لە شوێنێك پیاوێکی تێگەیشتوو و ئاخافتنێکی هۆشمەندانە هەیە تا بە مەبەستی لەبیرچوونەوەو کات بەسەر بردن بە دوایاندا بگەڕێت، وەك دەرمانێکی دەگمەن کە دەست ناکەوێت.

***

پێشتر گوتراوە، ئەویش ڕاستە، ژیانی ڕاستەقینە لە گۆڕەپانەکەدا هەرگیز ناگۆڕێت، بەڵکو کات دەگۆڕێت، لەگەڵ کاتیشدا وێنەی ژیان بەرانبەر بە هەر یەکێکمان، وێنەیەکە زوو دەست بە ئاوابوون دەکات، ئەو کات چاودێری لە ڕووی بیرکردنەوە لە پاییزو زستان و شەوانی دوورو درێژ یان ڕۆژانی سەردو باراناوی دێتە ئاراوە. ژیان لای قەشە پیتەر بەردەوام لەسەر یەك ڕێتم بوو، وەك تونێلێکی تەسك ڕووناکی کز بێت، تونێلێك بە شێوەیەکی هەست پێکراو ناگۆڕێت، هەر هەموو ئەو شتەی لەبارەوە دەزانرێت ئەوەیە کە هەموو ڕۆژێك بە ڕادەی یەك تا دوو بست تەسکتر دەبێتەوە، ئا لێرەوەیە گیراوەکان تووشی ئەو پەشۆکاوییە کورتە دەبن، کە ناتوانن بەرەنگاری ببنەوەو، لەژێر قورساییدا ملهوڕترین پیاو سەر دادەنەوێنێت تەنیا بۆ چەند چرکەیەکیش بووبێت.

قەشە پیتەر بەدوورو درێژی لەبارەی ئەو ڕۆژانەوە ئاخافت ـ جار نا جارێك ـ لەسەر سەرینەکە بەرز دەبووەو دانیشتنەکەی ڕێکتر دەخستەوە، بەشداری لە مەودا بەفرینەکەدا دەکردو، هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ یادەوەرییەکانیدا دەهات، بە دەنگێکی لەسەرخۆو بیستراو گوتی:

(زانیم کە دیل بوونم زۆری درێژە کێشا، بەپێی خواستی دادوەرانەی یەزدان، لەو کاتەیشدا پێوەندی برایانەم لەگەڵ (جەمیل)دا بەستبوو، لە پێناوی ئەویشدا خەفەتم خوارد. کەمتر بیرم لە خۆم و بەدبەختی خۆم دەکردەوە. ئێستەیش ناتوانم بەرگری لەخۆم بکەم بۆ ئەوەی ئەوە ڕەت بکەمەوە، بەڵکو خۆم ئاگەدار دەکەمەوەو داوای لێ دەکەم ئوقرەی درێژ بێت، بەڵام ئوقرە چۆکم دەشکێنێت. شەو درێژەو، ڕۆژیش درێژتر، بیرکردنەوەیش زۆر دژوارو گرانە. ئەو شتەی پتر بێزارم دەکات ئەوەیە کە دەزانم من بێ تاوانم. نە ئەوان لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکەن و نەیش یەکێك لە دەرەوە دێت و سەرم لێ دەدات یان هەواڵی شتێکم پێ ڕادەگەیەنێت. کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە خوێن دێتە کەللەی سەرم و، بێزار دەبم و ئارەزوو دەکەم بە دەنگی بڵند هاوار بکەم.

بەڵام خۆم هێور دەکەمەوەو، ئوقرە دەگرم و لە ناخەوە خۆم دەخۆم، تەنیا دەپرسم چی دیکە چاوەڕێم دەکات. زۆر شتی جیا جیا بە بەرچاومدا هەڵبەزو دابەز دەکەن، هەموو

شتێك دەبینم، تەنیا دەرچوون نەبێت. لە هیچ کوێیەك مرۆڤێك نییە لەگەڵی بدوێم. بێکاری و دەست بەتاڵی جڵەویان لێ سەندووم و لەهەموو شتێك پتر کاریان تێکردووم. ڕانەهاتووم. نە کتێب و نە ئامێر هەن. لێم پرسین هیچ کارێك نییە بیکەم؟ تا هاوەنی قاوە کوتێك چاك بکەمەوە یان سەعاتێك پاك بکەمەوە، هەر شتێك بێت. من پیشەکارم و سەر بەو جۆرە ئادەمیزادانەم. بەڵام پاسەوانەکە تەماشام دەکات بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت. لێی دەپاڕێمەوە لە سەرۆکی پاسەوانەکان بپرسێت. بۆ سبەینێ پێم دەڵێت:

ـ لەسەر بەڕەی خۆت دانیشەو جارێکی دیکە باسی ئەوە نەکەیت!

بە تێڕوانینێکی ناشیرینەوە تیم دەڕوانێت و پشتم تێ دەکات. ویستم پاساو بۆ هەڵوێستەکەی خۆم بێنمەوە، بەڵام کەللە ڕەق و دڵڕەقە:

ـ ئەم کارە ڕێی تێدەچێت کاتێك یەکێك بە نهێنی هەڕەیەك یان مەورەیەك دەهێنێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانی لێرە دەرباز بێت، بەڵام ئێمە بە خۆمان و لە خۆمانەوە بیدەینە دەستی کەسێك، ئەوە ڕێی تێناچێت. تۆ باش پلانت بۆ ئەوە دانەڕێژاوە.

ئەوەی گوت و تفێکی کردو ڕۆیشت. منیش وەك یەکێك تەڕ بووبێت مامەوە. ویستم لە پشتەوەی هاوار بکەم بێ تاوانم و، هەرگیز بیرم لە هەڵاتن نەکردووەتەوە. لە شوورەییدا کە گیانی هەژاندم فرمیسك زاییە چاوم، پەیم بە نهێنییەکەی نەبرد. بەڵام کاتێك کەمێك بیرم کردەوە بینیم ئەوەی ئەو پیاوە درکاندی دروست بوو. سەرزەنشتی خۆم کرد پتر لەوەی سەرزەنشتی ئەو بکەم. ئەقڵ و بیرم لەکوێ بوو؟ کاتێك خەڵکی دادەبەزنە ئەو ئاستەی وەك من دابەزیوم ئەو کات کەس باوەڕیان پێ ناکات، بە ڕاستی منیش لە یادم چووەتەوە لە کوێم!

بەم شێوەیە، سەرلەنوێ ئائومێدو دڵتەنگ و غەمبار چاوەڕوانی خۆرئاوابوونێکی دیکە هاتنی شەوێکی دیکە دەکەم کە سستتر تێدەپەڕێت.

ڕۆژێکیان هەردوو بازرگانە بولغارییەکەیان ئازاد کرد. لە جیاتی ئەوەی بەرەو دوورخراوەیی بڕۆن، بەرەو ماڵ کەوتنە ڕێ. وەك چۆن باوە، بۆ چاکە ئەو حەسیرەیان پێ بەخشیم کە لەسەری دەنووستن. یەکێکیان گوتی: بگرە، ڕەنگە هەتاو تۆیش گەرم

بکاتــەوە. بەچــرپەوە ئــەوەی گــوت و ســەری بــەو لادا وەرچــەرخاندبوو. وەك دوو ســێبەر ڕۆیشتن. تەنانەت نەیانتوانی خۆشی و شادی بنوێنن. بێ ئەوان ژیانم دژوارتر بــوو. وێــڕای هەموو خەم و خەفەتەکانم کەچی هەر بیرم لە جەمیل دەکردەوە، وەك چــۆن بــیرم لــە خــۆم دەکردەوە، بیرم لە ئاخافتن و لە چارەنووسە تاڵەکەی دەکردەوەو پاشان ڕادەمام.

بەیانیان زوو هەڵدەستام و هێور هێور چاوەڕوان بووم دەرگەکە بکرێتەوە. لەو بۆگەنی و بۆنە ناخۆش و ئەو خەم و خەفەتە بچمە دەرەوە. لەژێر بۆڕییەکەدا خۆم دەشوشت پاشان دادەنیشتم و کاتم بەسەر دەبرد بەر لەوەی ئەو بوونەوەرانە لەژوورەکانیان برژێنــە دەرەوە. بەڵام بەرەبــەیان لــە ئەســتەنبوول چ جــۆرە ئــەوە شــتێکە ناکرێــت بــاس بکرێــت. شــتێکە لەوەوپیش لە ژیانمدا نەمبینیوەو تا ماویشم نایبینم (بەڕاستی خواوەند ئەمەی ویستووەو ئەم هەموو جوانییەی بە دوژمنان بەخشیوە!) ئاسمان ســوور دەبێتــەوەو دادەبەزێتــە ســەر عەرد، ئەوەند دەوڵەمەند بەشی هەموو کەس دەکــات، دەوڵەمەنــدو نــەداران، ســوڵتان و کۆیلەو بەندکراوەکان. بەم شێوەیە دادەنیشم جگەرە دەکێشم و کات بەسەر دەبەم ـ ئەگەر تووتن هــەبوو ـ ئەگەرچــی جگــەرە کێــشان ســەرم دێنێتــە ژان تــا ســەرەگێژە دەمگرێــت. دووکــەڵی دەوروبــەرم و لــە تەنیشتیــشمەوە جــەم ـ جــەمیل ســێبەری بــۆ کــردووم کــە نەنووســتووەو بــە هــەردوو چــاوە پــڕ فرمێــسکەکانیەوە ڕەنگــی پــەڕیوە، بــە شــێوەیەکی دۆستانەو ڕاشکاوو ئاسان لەگــەڵی دەپــەیڤم، وەك ئــەوەی نــەمویرا هــەرگیز بــەو شــێوەیە لەگەڵی بئاخڤم کاتێك لێرە بوو هەروەها ئەو کاتەی بەیەك دەگەیشتین، تەواو وەك ئەوەی لەگەڵ قەشەیەکی لاوی (دێر)ەکەی خۆم بدوێم کاتێك شەکەتی و ناخۆشــی ژیــان ســەریان تێدەکردو، شانیم دەگرت و هەڵم دەتەکاند:

ـ زوو هەستاویت، بەرەبەیانت فریو داوە! بەیانییە جەمیل ئەفەندی. گوێم لێ بگرە!

سەری دەلەقێنێتەوەو دەڵێت:

ـ بەلای منەوە شەوو بەرەبەیان هەموو هەر یەکن، من بەیانیم نییە.

ـ چۆن بەیانیت نییە، هاوڕێ، برالــە؟ قــسەی هەڵــەق و مەڵــەق مەکــە چــوون شــێتان مەئاخڤە. مادامەکی تاریکی هەیە ئەوە بەیانیش هەیە. ئەم جوانی یەزدانییە نابینیت؟

- نابینم
سەری دانەواندبوو، بەدەنگی پچڕ پچڕ ئەوەی دەگوت.
زۆرم بەزەیی پێدا دەهاتەوەو خەفەتم بۆ دەخوارد، نەشمدەزانی چی بکەم بۆ ئەوەی یارمەتی بدەم، لە کاتێکدا هەموو گۆڕەپانە نەفرەتییەکەی دەورو بەرمان ڕووناکی دایپۆشیبوو.
- دەی بەستەزمان، شتێك مەڵێ پێویست نەبێت. کارێکی وا مەکە ڕوحی خۆت تاوانبار بکەیت. یەزدان بەزەیی پێماندا دێتەوە، لەم نەخۆشییەت چاك دەبیتەوە، ئەو کات کە تەندروستیت باش دەبێت و ئازادیت دەبیت، هەموو شتێکی جوان و هەموو شتێکی باش دەبینیت.
تەنیا سەری دادەنەواند.
- دەیگوت - ئەی پیاوی باش من ناتوانم چاك ببمەوە چونکە من نەخۆش نیم، بەڵکو من هەر وەك چۆن بوومە بەو شێوەیەم و، مرۆڤ بۆ خۆی چاك نابێتەوە.
بەم شێوەیە ئەو قسانەی دەکرد کە خۆیشی نەیدەزانی چی دەڵێت، خەفەتی دەخواردو خەفەتبار بوو تا ڕادەیەك دڵڕەقترین پیاو ببینیایە بۆی دەگریا. سەرەخۆشی خۆمی بۆ دەردەبڕم بەڵام بێ سوودە. وەك باوکێك سەرزەنشتی دەکەم چونکە ئەو شتانەی دەوروبەری خۆی نەدەبینی و ئەو شتانەی دەبینی کە هەر نەبوون. ئەگەر ڕاستیمان بوێت منیش هەستم بە تاریکایی بەرەبەیانی ڕوونی بەردەمی خۆم دەکرد، بەڵام قسەکان بەرەو نوکتەیەك دەبەمەوە. تووتن دەردێنم.
- دەی با هەر یەکەمان جگەرەیەك بپێچینەوەو، ژەنگ فڕێ بدەینە سەر عەرد، ئەوە چیمان بەسەر هاتووە! دایگیرسێنین؟
- دایدەگیرسێنین - دەیگوت بە زۆری لەبەر من دایدەگیرسێنین.
ڕادەمێنێت و دەست بە جگەرەکێشان دەکات، کەس نازانێت هزری بۆ کوێ دەچێت. بە زارێك دووکەڵ بەبا دەدات وەك بڵێیت مردووە، لەناو فرمێسکەکانیەوە تەماشام دەکات. ئەی جەمی بەدبەخت. جگەرە پێچراوەکەی دەکوژێتەوە.

یەکێك لە شوێنێکەوە هاواری لێ بەرز بووەوە (دوو کەس بەشەڕ دەهاتن) ڕاپەڕیم. لەوە دڵنیا بووم کە کەس لە تەنیشتمەوە نییە. جگەرە پێچراوەکەم کوژایەوەو هێشتە دەستم درێژ کردبووەوە. ئاخ، خۆ ئەوە لەگەڵ خۆمدا دەدوام! لە شێت بوون دەترسام وەك چۆن لە پەتا دەترسام، وەك چۆن تەنانەت لە بیرکردنەوە، لەوە دەترسام ئەو پیاوە بەتەندروستەی ئێرە وردە وردە بێ هۆش ببێت و ببووریتەوەو بچێتە باری خەیاڵ پلاوییەوە، ڕادەوەستام بۆ ئەوەی خۆم قوتار بکەم، لەناخی خۆمدا خۆم دەخۆمەوە، کرژ دەبم تا بیرم دەکەوێتەوە کە من کێم و چیم، لە کوێوە هاتووم و چۆن گەیشتوومەتە ئێرە. لەبەردەم خۆمدا ئەوە دووبارە دەکەمەوە بۆ ئەوەی قایلی بکەم کە جیهانێکی دیکە لەدەرەوەی ئەم گۆڕەپانە هەیە، جیهانێکی جیاتر هەیە، گۆڕەپانەکە هەموو شتێك نییەو، هەمیشەیی نییە. دەکۆشم ئەوە لەیاد نەکەم و، لای ئەو بیرۆکەیە بێنمەوە. هەست دەکەم چۆن گۆڕەپانە نەفرەتییەکە مرۆڤ وەك گێژەنگی ڕووبار بەرەو قووڵاییەکی تاریك هەڵدەلووشێت.

***

بۆ ئەو ئاسان نەبوو، تەنانەت بۆ دژوارترین پیاو ئاسان نەبوو، ڕۆژگار بەسەر ببات و چاوەڕوانی شەوگار بێت لە کاتێکدا بەو هزرانە بارگاوی بێت، لەکاتێکدا ڕۆژگار هیچ گۆڕانێك یان هیوایەکی لەگەڵ خۆ ناهێنێت. هیچ شتێك تەنیا نزیك بوونەوەی حایم نەبێت، ئا ئەوەتانێ هەموو ڕۆژێك نزیك دەبێتەوە، بەڵام ناتوانێت دەرگەی هیچ وتووێژێکی ڕاستەقینەی لەگەڵ والا بکەیت. بەستەزمانە هەموو ڕۆژێك پتر نغرۆ دەبێت و، بە ناو سەربوردە ڕەش و ترسە ئەندێشەییەکانیدا ڕۆ دەچێت. بێ هوودە هەموو جارێك قەشە پیتەر پرسیاری لێ دەکات ئایە شتێکی لەبارەی (جەمیل)ەوە بیستووە. ئەو هیچ شتێك نازانێت، بەڵکو هەرگیز بایەخ بەو پرسە نادات. وا پێدەچێت کە ئەو لاوەی خەڵکی شاری سمیرنای لەیاد نەبێت. بەڵکو ئەوەی لە ناخیدا دەورووژاو دەکوڵا ڕیسوایی دیکەی نوێ و تۆمەتی دیکە بوو کە بەوپەڕی چوست و چالاکی و بەگوڕ بە هەموو وردەکارییەوە دایدەڕشتن، وەك ئەوەی بڵێیت بەخۆی هەموو شتێکی بینیوەو لەگەڵیاندا ژیاوە. پاشان خێرا لەیادیان دەکات وەك چۆن بیری کەوتوونەتەوە. پێدەچێت لەم جیهانە

گەورە هەمووی ئەو هەموو دەنگ و باسە ناخۆش و ستەم و مەینەتییە نەبن بەشی ئەو بکەن. بۆیە ئەو بە خۆی لە ناخی خۆیدا دایدەڕشتنەوەو، دەیگێڕانەوە، پاشان لەیادی دەکردن.

حاییم پاش ڕێ و ڕەسمی تەواوی خۆپارێزی، دەچوو لە تەنیشت (یەکێك لەو پیاوانەی دەشێت بروایان پێ بکرێت) دادەنیشت بۆیە قەشە پیتەر بەناچاری دەبوو خۆشحاڵی خۆی پیشان بدات و بەسەر شانیدا بدات:

- حاییم چیت پێیە، چەندم پێ خۆشە، چی شتێکی نوێت پێیە؟

بەڵام حاییم بە نیگایەکی ڕەشی گرژەوە، بەهەردوو گلێنەی چاوی تەماشای دەکات کە بە شێوەیەکی نەگونجاو لە شوێنی خۆیاندا نابن، وەك بڵێیت گوێی لە وشەکانی نەبێت.

بە دەنگێکی گڕ دەڵێت:

- گوێ بگرن. من نازانم ئایە ئێوە بیرتان لەمە کردووەتەوە. لای منەوە لەم ڕۆژانەی دواییەدا ئەو بیرکردنەوەیەم ـ لێ دوور ناکەوێتەوە، بەڵکو زۆرم پێدا گیری لێ دەکات، کە لێرە پیاوێکی دروست نییە تەواوی ئەقڵی هەبێت! هەموویان شێت و نەخۆشن، بەندکراوو پاسەوان و سیخوڕەکان(هەر هەموویان سیخوڕ بوون)! سەبارەت بە شێتە گەورەکەیش هیچ ناڵێم، قەرەقۆز، پیاوی وەك ئەو لە هیچ دەوڵەتێکی دیکەی سەر ڕووی ئەم زەوییە نەدەبوو تەنیا لە شێتخانەکاندا نەبێت ئەویش لە مێژە. بە کورتی ئەمە ئەوپەڕی شێتایەتیی هەموو خەڵکە، ئێوەو منیان لێ دەرچێت.

دەنگی دەلەرزی، ئەمەیش قەشە پیتەری ناچار کرد چاوی بەرز بکاتەوە تا بە شێوەیەکی باشتر تەماشای بکات. حاییم لەپێشوو باریکتر بوو، وەك جاران ڕیشی نەتاشیبوو، هەردوو چاوی سوور هەڵگەڕابوون، وەك ئەوەی بڵێیت ماوەیەکی زۆر لە تەنیشت سۆپا یان ئاگرێکی دووکەڵاویەوە دانیشتبێت. سەری لەسەرخۆ دەلەرزی، دەنگی باریك و قرخ و خنکاو دەبیسترا.

- بە ناموسم سوێند دەخۆم، هەر هەموویان شێتن!

قەشە پیتەر هەستی بە شەرمەزاری کرد، موچرکەیەکی سووک پشتی سەری تەنییەوە. تاوێك خەیاڵی ئەوەی کرد کە گۆڕەپانە نەفرەتییەکە لە ڕاستیدا هیچ دەروازەیەکی نییە.

لەو ڕۆژەدا یەکەمین و خۆشترین هەواڵ لە دەرەوە هات.

وەك هەموو بەیانییەك، لە گۆڕەپانەکەدا پیاسەی دەکرد، دوو بەندکراو لە تەمەنی هەرزەکاردا بوون، لە پێشبڕکێیەکدا یەك بە دوای یەکدا ڕایان دەکرد، لە کاتێکدا بازنەیان لەچوار دەوری قەشە پیتەر دروست دەکردو خۆیان لە پشتیەوە دەشاردەوە. قەشە پیتەر هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. تا دەهات بازنەکان بچووکتر دەبوونەوە. بەر لەوەی بتوانێت لەو دوو منداڵە بەرەڵلایە دەرباز بێت، یەکێکیان کە هێشتە هەر ڕای دەکرد پێوەی نووسا، وەك چۆن مرۆڤ بە داڵدەیەکی زیدنووەوە دەنووسێت. قەشە پیتەر هەستی کرد منداڵەکە پارچە کاغەزێکی نووشتاوەی خستە ناو لەپیەوە، بەر لەوەی درێژە بە ڕاکردن بدەن لێی دوور بکەونەوە. قەشە پیتەر ترساوو شڵەژاو بۆ کۆتایی گۆڕەپانەکە پاشەکشەی کرد. کاغەزەکە بە زمانی تورکی بە دەست و خەتی یەکێك نووسرابوو کە نەیدەناسی: (لەماوەی دوو ڕۆژدا گرکان ئازاد دەکرێت).

ئەو ڕۆژەی بە شڵەژاوی بەسەر برد، هەروەها شەوی دواتریش. زۆر ڕوون بوو کە گومانی ئەوەی لا نەمێنێت کە قەشە تادی ئەو هەواڵەی ناردووە.

ئەوەبوو بە ڕاستی ڕۆژی دواتر پاسەوانێك هات و داوای لە قەشە پیتەر کرد شتەکانی کۆ بکاتەوەو خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکات. کە ئێوارە داهات دەریان کردو بەرەو دوورخراوەیی بۆ (عەقرە)یان نارد. ئەگەرچی لەوە دڵنیا نەبوو قەشە تادی نامەکەی ناردبێت ئێستە لەوە دڵنیا بوو، چونکە قەشە تادی لە ژیانی خۆیدا پێشبینی هیچ شتێکی دروستی نەکردووە.

ئەو شەوە قەشە پیتەر لە سەر کەناری ئاسیا لەو شوێنە ڕاوەستا کە بۆ ئەوە دەستنیشان کراوە دوورخراوەکان بەر لە ڕۆیشتن لێی کۆببنەوە. بۆ یەکەمین و دوایەمین جار شاری (ئەستەنبووڵ)ی بە هەموو جوانی و بە هەموو دەستەڵاتیەوە بینی.

ـ هەوا فێنك و شیرین بوو، مرۆڤ لە نێوان بیست دوورخراودا هەست بە شەرمەزاری و بزربوون دەكات. شەوێكی تاریك بوو نە مانگ و نە ئەستێرەی تێدا دیار نەبوو. ئەستەنبووڵ لە كەناری لای ڕاستەوە بە پۆشاكی شەوانەوە لە مەودای بازنەیەكی تەواوی ڕوانیندا ڕاكشابوو. لە یاری ئاگرین دەچوو لەكاتی بەرزبوونەوەدا ڕاوەستابێت. (مانگ مانگی ڕەمەزان بوو)، چرا لەسەر منارەی هەموو مزگەوتەكان داگیرسابوون وەك كۆمەڵە ئەستێرەیەكی ڕاستەقینە لەسەر ڕووناكییەكانی شارەكەوە دیار بوون كە لە ئەژمار نەدەهاتن. زۆربەی گیراوەكان دانیشتبوون و سەریان دانەواندبوو، لە كاتێكدا هەندێكیان ڕاكشابوون، قەشە پیتەر ماوەیەك دەینواڕی و بەراوردی ئەوەی دەكرد كە ئەستەبوول بە ڕۆژ چۆنەو ئێستە چۆنە، وەك شەپۆلێكی تۆپەڵە ئاگر بەوپەڕی هێزو تواناوە لە ئاسمانێكی نەبینراوو شەوێكی بێ كۆتایی خۆی دەنوێنێت. (چەندە كاتی ویستووە تا ئەم هەموو چرایانە دابگیرسێنرێن؟ ئەی كێ دەتوانێت بیانكوژێنێتەوە؟). وای هاتە پێش چاو كە گۆڕەپانە نەفرەتییەكە لێرە لە شوێنێكی ئەو ڕووپێوە بچووكە تاریكانەی نێوان ئەو چرا پەرش و بڵاوانەدا شوێنی هەر نییە. لە كاتێكدا ماندوو بوو ئاوڕی ئەو لای دایەوە، لای ڕۆژهەڵاتی تاریكی كەڕ. ئەویش وەك ئێرە وایە، تا چاو بڕكات هیچ شتێكی دەستنیشان كراو نییە ڕووناك كرابێتەوە. هزر گێڕۆدەی گۆڕەپانە نەفرەتییەكە بوو. لە گەشت كردنیشدا گۆڕەپانە نەفرەتییەكەی هەر لە یادە، تا دەگاتە (عەقرە) بە ئاگەیی و بە فووستوویی و، لە ماوەی مانەوەی لەوێ و، بگرە دواتریش هەر لە یادی ناكات.

ـ لە عەقرە ژیام و زۆر شتی سەیرم بینی. باسی هەندێك شتم بۆ كردیت و زۆر شتی دیكەیش ماون كە نەگوتراون. چاوم بە زۆر كەسانی داواكراوو دوورخراو كەوت، لە هەموو ئایین و لە هەموو گەلان، لەو تاوانبارانەی كە زۆرترین كات بێ تاوان بوون. زۆریان ماوەی چەند مانگێكیان لە گۆڕەپانە نەفرەتییەكەدا بەسەر بردووەو قەرەقۆزیان دەناسی.

پیاوێكی لوبنانی لاو توانیبووی تەواو بە دەنگ و بە ڕۆیشتن لاسایی بكاتەوە، تەنانەت ئەوەندە پێدەكەنین وەنەبوو شەق بەرین، كاتێك لەبەردەمماندا ڕێی دەكردو هاواری دەكرد: (چی دەڵێیت نەتاوانباریت و نەیش هەڵەت كردووە؟، ئێ، ئەمە باشە چونكە

ئێمە پێویستمان بە یەکێکی بێ تاوانی تەواو وەك تۆیە!). پیاوێکی بە قەڵافەت بوو، بە پانایی گەورەتر بوو لەوەی بەدرێژی، بە سەرێکی گەورەی تاشراوەوە، لەگەڵ دوو چاویلکەی شووشە ئەستوور، سەرتاپای نوکتەو پێکەنین بوو. کریستیان بوو. کاتێك پتر یەکدیمان ناسی ئاگەدارم کردەوە کە من کێم و لە کوێوە هاتووم. زۆر ئاشکرابوو کە زۆر زیرەکترو ترسناکتر بوو لەوەی خۆی پیشان دەدا. وەك پێدەچوو پیاوێکی سیاسەتوان بوو. گاڵتەی دەکردو پێدەکەنی، پاشان یەکسەر لە تەنیشتمەوە دادەنیشت و بە پێکەنینەوە دەیگوت: (ئاخ، قەرەقۆز باشە، بە ڕاستی باشە)، منیش سەرم سوڕ دەمێنێت: (چۆن باشە؟ ئای لە خراپی ئەو باشییە!). وەڵامی دەدامەوە: (نا، نا، ئەو ئەو پیاوە ڕاستەقینەیە لە شوێنی ڕاستەقینە لەم سەردەمەی ئێمەدا). پاشان بە دەنگێکی دیکەی نزم بە گوێوەی دەچرپاندم و دەیگوت: (ئەگەر دەتەوێت نهێنی هەر دەوڵەتێك بزانیت و، چۆن سەرکردایەتی دەکرێت و، ئایندەی چۆنە، هەوڵ بدە بزانە چەندین شکۆمەندو سەربەرزو بێ تاوان لە زیندانەکانی ئەو دەوڵەتەدا هەن و، چەندین تاوانبارو شەڕخوازی هەیە ئازادن و دەسووڕێنەوە. ئەمەت لا باشترین بەڵگە دەبێت)ـ هەموو ئەوەی وەك تێبینییەکی سەرپێیی لەکاتی قسەکردندا گوت. پاش ئەوە هەڵدەستاو هەردوو دەستی دەخستە گیرفانیەوەو، پیاسەی دەکردو وەك قەرەقۆز هاواری دەکرد، تا هەموومان ناچار پێدەکەنین. من لە ماوەی ئەو نوکتەو پێکەنینەدا بەردەوام بیرم لە جەمیل دەکردەوە، بۆیە شتەکەم زۆر لا دژوار بوو، چونکە کەس نەبوو لەگەڵم لەبارەی ئەوەوە بدوێین، جا لەبەر ئەوەی لە ماوەی ژیانمدا، وەك دەبینم، هەستم بەو جۆرە خەم و خەفەتە نەکردووە سەبارەت بە پیاوێك وەك چۆن لە بارەی ئەوەوە هەستم بە خەفەت و پەژارە کردووە.

قەشە پیتەر ماوەی هەشت مانگ لە عەقرە مایەوە. پاشان بە کۆششی قەشەکانی هاوەڵ و برادەرو هەندێك لە پیاوانی ناودارانی تورك ئازاد کراو لەگەڵ قەشە تادی ئۆستویچ بۆ بۆسنیا گەڕایەوە، لە هەمان ئەو وەرزەی بەر لە ساڵێکی ڕەبەق بەجێی هێشتبوو، تادی ئەو ماوەیە لە ئەستەنبووڵ مابووەوەو لە هەموو لایەکەوە هەوڵی دابوو تا ئازادی کرد.

ئەوەیش کۆتاییە. هیچ شتێکی دیکە نابینرێت تەنیا گۆڕێك نەبێت لە نێوان چەند گۆڕێکی نەبینراوی قەشەکان نەبێت، وەك بلقێك لەناو بەفرێکی بەرزدا بزرەو وەك ئۆقیانووس فرەوانتر دەبێتەوە، تا هەموو شتێك دەکاتە بیابانێکی سارد کە ناوی نییە و هیچ خەسڵەتێکی نییە. هیچ بەسەرهات و قسەی دیکە نییە، وەك بڵێیت جیهانێك نەبێت شایەنی ئەوە بێت مرۆڤ لە پێناویدا پیاسە بکات و بڕوانێت و هەناسە بدات. نە ئەستەنبووڵ دیارەو نە گۆڕەپانە نەفرەتییەکە. لاوەکەی شاری سمیرنا نییە، کە جارێك بەر لە مردن مرد، کاتێك بیری کردەوە کە بە ڕاستی یان دەشێت برای سوڵتان (جەم)ی بەدبەخت بێت. نە (حاییم)ی بەدەستەزمان و، نە عەقرەی ڕەش و، نە خراپەکاری مرۆیی و، نە ئومێدو نە بەرخودان کە بەردەوام یاوەریەتی. هیچ شتێك نییە. هیچ شتێك نییە تەنیا بەفرو ڕاستی ڕووت، چار نییە مرۆڤ هەر دەبێت بمرێت و بچێتە ژێر گڵ.

لاوەکە کە لە تەنیشت پەنجەرەکەوە ڕاوەستابوو، بیرەوەری گێڕانەوەکان ساتێك بیریان پەرت کردبووەوەو، تەنیا ساتێك بیری لە مردن دەکرەوە، بەو شێوەیە هاتە پێش چاو. سەرەتا بە شێوەیەکی هەستوەرانە، پاشان ئاوازدارتر، وەك بڵێیت لەسەرخۆ لەخەو ڕادەچەنێت. دەنگەکان ئەوانەی لە ژوورەکەی تەنیشتەوە دەهاتن پترو زۆرتر بەر گوێ و هەستی دەکەوتن، ئەو ڕێتمە نارێکەی لە ئامێرە میتاڵەکانەوە بەرگوێ دەکەوتن کە فڕێ دەدرانە سەر شتە کەڵەکە بووەکان و دەنگی کپیان بڵاودەکردەوە، دەنگی میۆ یۆسیچ کە ئەو ئامێرانەی دەژمارد خوالێخۆشبوو قەشە پیتەر لە دوای خۆی بەجێی هێشتوون.

ـ بەردەوام بە! بنووسە. هەرەیەکی ئاسنینی بچووکی ئەڵمانی، یەك دانە!.

❊❊❊

**(الفتنة الملعون) گۆڕەپانی نەفرەتی، ئیڤۆ ئاندریچ، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: د. وەلید السباعي، لەبڵاوکراوەکانی یەکیەتی نووسەرانی عەرەب، دیمەشق ١٩٩٢.**



نووسەر ڕووداوو بەسەرهاتەکانی ئەو گەلانەی لە وڵاتی بۆسنیاو هەرزە گۆڤینا دەژین وێنە دەکێشێت. کە بە دەستی داگیرکاری جارێك تورکان و جارێك ئەمساو مەجەرو جارێك سیربەکانەوە تاڵترین ژیان دەگوزەرێنن و خەم و خەفەت و پەژارە دەیانپووکێنێتەوە، ئەو داگیرکاری و زوڵم و زۆرەی دەستەڵاتدارانی عوسمانلی لەو گەلانەیان دەکرد لەو کارە نامرۆڤانەدا ڕەنگی دەدایەوە کە کۆرپەی بەر مەمکان و منداڵانی ساوایان لە دایك و باوکان دەکردەوەو بەرەو شوێنێکی دوور لەوڵاتی خۆیان، بۆ ئەستەنبوولیان دەبردو لەوێ دەیانهێنانە ژێر ئایینی خۆیانەوەو ناویان دەگۆڕین و دەیانکردنە ئەندامانی سوپای ئەنکشارییەو شەڕی وڵاتانیان پێ دەکردن، ئەم کارە لەگەڵ کاری سەفەربەرلکی سەردەمی یەکەمین جەنگی جیهانیدا لە وڵاتی خۆمان یەك دەگرنەوە، کاتێك باوك و براو مێردو مام و خاڵ و کوڕیان لە کەس و کاریان دەکردنەوە بەرەو بەرەکانی جەنگیان ڕادەپێچان و دواتر بێ سەرو شوێن دەبوون و دەکوژران و نەدەگەڕانەوە.






وەزارەتی ڕوشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی
ڕوزنامەنووسی و چاپ و بلاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بلاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوەو بلاوکردنەوەی موکریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT
FOR RESEARCH & PUBLICATION
www.mukiryani.com

چاپخانەی ڕۆشنبیری